# دروستبونی ژیان و
# بیردۆزی پەرەسەندن

نوزاد

انهيار نظرية التطور

The Collapse Of Evolution Theory

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com








ناظم ناصح

لقد خلقنا الإنسان في أحسن تقويم

التفسير

مافی لەچاپدانەوەی پارێزراوە بۆ
نوسینگەی تەفسیر

ناوی کتێب بەکوردی: دروستبوونی ژیان و بیردۆزی پەرەسەندن
نوسینـــــــــی: ناظم ناصح عثمان
بڵاوکردنـــــــەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەومو ڕاگەیاندن/ هەولێر
نەخشەسازی نـــاوەوە: جمعە صدیق کاکە
خـــــــــە ت: نەوزاد کۆیی
بـــــــــەرگ : أمین مخلص
نـــۆرە و ســاڵی چـاپ: یەکەم ١٤٣١ك — ٢٠١٠ز
تـــــــــیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٤٨٠ ) ساڵی ٢٠١٠ پێدراوە

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٣٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پـــێــشــکـــەشـــە

★ بەو مرۆڤەی، کە بە بچووکترین داهێنانیش بێت، هەوڵ دەدات خێرو خۆشی و خۆشەویستی بۆ مرۆڤایەتی دەستەبەر بکات....

★ بەو مرۆڤەی، کە نرخ وقیمەتەکانی مرۆڤ بە تەرازووی (ولقد كرّمنا بني آدم) دەپێوێت و هەرگیز ئامادە نییە ببێتە ڕۆڵەی مەیموونەکان....

★ بەو مرۆڤەی، کە هەرگیز بە ئەفکاری نابەجێ سەری لێ ناشێوێت و ئامادەش نییە بە نووسینەکانی سەر لە خەڵکی بشێوێنێت....

★ بەو مرۆڤەی، کە مەخلوقێکی ئەوەندە گەورەو سەیرو بێگەردە، بە جۆرێك کە نەخشی ڕووە ڕووناکەکەی گەورەترین بەڵگەو دەلیلە لە سەر گەورەیی و دانایی ئەو خالقەی کە دروستی کردووە...

ناظم ناصح

# پـــێـــشـــەكـــی

كـات دوای نیـوەڕۆ بـوو، لـە نێـو ڕۆژێكـی گـەرم و پـڕ نـوور لـە وەرزی هـاوین، بریسـكەی بریسـكاوەیی تیشـكی هـاتووی پڕشـنگداری نێـو چـەقی خۆر لەنێو بەرزایی ئاسمانەكاندا، ڕووگەشـانە مـژدەی ڕووناكیـان بـە زەوی ئـەدا، بـە تـەنیایی و لـە بـەردەم پەنجەرەكـەو ڕوو لـە گـەڵا جوولاوەكـانی درەختـە بـاوەش لەیـەك گرتووەكـان دانیشـتبووم. كـزە بـای گـەرمی ئـەم هاوینە لەم پاش نیوەڕۆیەدا، جیهانی باڵندە مژدە بەخشـەكانی سـەر لـق و پـۆپی ئـەو دارانـەی وا بەبەرچـاوەمەوە ڕازانـدبووەوە بـەجۆرێ كـە تێكـەڵ بوونی ئـەو باڵندانـەو خۆهەڵـدانیان بـەرەو چڵە بـەرزەكانی ئـەو درەختـە بەنـد كراوانــەو چـریكەو چـرپەی هەمـەجۆریان، پارچـەیەك مۆسـیقای سروشتی وا گرانبەهاو بـەهاداریان بەبـەر گوێمـەوە دەسـازاند كـە خۆزگـەم دەخواست عاشقێكی سروشتناسـی وەكـو مەولـەوی دۆسـتی ئـەو دانیشـتنەم بوایـەو میـوانی ئـەم سروشـتە پـڕ ئیلـهام و پەیامـە بوایـە، تـاوەكو لـە دیـــدەنگای ئـــەم جیهانـــە ڕەنگـــاو ڕەنگـــەداو لـــەنێو قووڵـــایی خەیاڵـــە فراوانەكەیـدا، جوانـترین و پڕشـنگدارترین هـۆنراوە لـە زێـڕینترین ووشـە بریسكاوەكانی نێو فەرهەنگی كوردەواریدا بهۆنێتەوەو گۆرانییەكی ویژدان لەرزێن تێكەڵ بە چریكەو مۆسیقای ژەنـراوی ئـەو باڵنـدە دەروون سـافانە بكات كە وەكو پشكۆی خوناوە فێنكەكانی دەمی بەرەبەیانی وەرزی زسـتان دابەزێتە سەر دەروونە گڕگرتووەكەم و تۆزێك هێوری بكاتەوە.

ئا لەو کاتەدا سەیرێکی بەردەستی خۆمم کرد بینیم وا قەلەمە تەمەڵەکەم وەکو هەتیوێکی بێ بەرگ و بێ نەوا کەوتووە لەسەر کۆنە دەفتەرەکەم وەك ئەوەی بڵێی کە دوو بەد بەختی چارە ڕەش سەریان بەیەکەوە ناوەو سکاڵای نەهامەتییەکانی ژیان ئاراستەی قەدەرو چارەنووس دەکەن. ئەوکاتە هەستم کرد کە قەلەمە ڕەشنووسەکەم چاوەڕوانی دەست و پەنجە لاوازەکانمە تاوەکو لەنێو پەنجەگەلێکی ساوادا هەڵبسوورێ و سەری خۆی شۆڕ بکات بەرامبەر لاپەڕە زەرد هەڵگەڕاوەکانی دەفتەرەکەم و دەفتەرەکەشم ئامادە بوو گشت ڕۆڵەکانی خۆی کە لاپەڕەکانیەتی، بیکاتە قوربانی بەردەمی تیرە تیژەکانی قەلەم، تاوەکو بەیەکەوەو دەست لەناو دەستی یەکتر بەشێکی ئەگەر کەمیش بێت لە زانیارییەکانی سەردەمی زانست لەنێو کۆگاو بانکی زانست و زانیاری جیهانیدا بگوێزنەوە بۆ نێو هەگبە نەخشین و ڕەنگینەکەی وڵاتی کوردان. ئا لەو کاتەدا وەك ئەوەی بڵێی کە خەوبینێك لە قووڵایی خەونە فرمێسکاوییەکەیدا ڕابچڵەکێ، کەوتەوە یادم کە من وا لەبیری نووسینی ووتارێکی زانستی هەستیار دام لەبارەی داروینیەت و بیردۆزەکانی پەیوەست بە ئارێشەی سەرەتای دەرکەوتنی ژیان تاوەکو پێشکەشی بکەم بە یەکێك لە گۆڤارە فکرییە کوردییەکان. لە درێژەو گەرمەی نووسینەکەمدا قەلەم تا دەهات زیاتر بۆ نووسین بەرەو خوار لێژ دەبوویەوەو بابەتەکە زۆر زیاتری هەڵدەگرت بەجۆرێك وام هەست دەکرد کە دەرهێنانی بابەتێکی کورت لەم زانستە درێژ بڕە، وەك دەرهێنانی جامێك ئاو وایە لە دەریایەکی گەورەدا، هەروەها کاتێك بینیم کە کتێبخانەو ئاستی ڕۆشنبیری کوردی زۆر لاوازو هەژارە لەم بوارەدا، بۆیە بڕیارم دا کە ووتارە زانستییەکە بگۆڕم بۆ توێژینەوەیەکی زانستی وا کە

تاراددەیــەك وەكـو ئینسـایكلۆپیدیای بـیردۆزی پەرەســەندن و داروینیــزم دەركـەوێ، بـۆ ئـەوەی نـاوەرۆكی ئـەم تیـۆرە فەلسـەفییە بناسـێنم بـە خوێنەران و ڕۆشنبیرانی كوردی.

كارەساتە بۆ ئێمە ئەگەر تیۆرێك نەناسین كە لە سەردەمێكدا جیهانی سەرقاڵ كردبوو بە فكرەو بانگەشە و بەڵگە هەمـە چەشـنەكانی لـەبارەی گـۆڕان و پەرەســەندنی گیانـــداران لــە جۆرێكــەوە بــۆ جــۆرێكی تــر. ڕۆشنبیرترین مرۆڤ ئەو كەسەیە كە شتی هەڵەو فریـودەر قبـول ناكات و ناتوانێـت بـاوەڕی پـێ بێنێـت و بـە بەڵگـەوە لـە دژی دەوەسـتێ، ئەگـەر گەنجانمان زانیاری تەواویان لا نەبێ لەبارەی ئەم بابەتە، ئەوا لەگەڵ هەر ڕووبەڕووبوونەوەیەكی زانستی لەگەڵ یەكێك لە بەڵگە زانستییەكانی ئـەم بیردۆزە، یەكسەر گـەنج چۆك بـە ئـەرز دادەداو ئیمانی پـێ دێـنێ چونكە زانیاری لا نییە تاوەكو موجادەلەی پێ بكات و بوونی خۆی بسەلمێنێت، كە ئەمەش لەلای هیچ مرۆڤێكی خـاوەن كەسایەتی قبـوڵ نـاكرێ و بێگومـان فێرخـوازی كـوردی خـاوەن كەسـایەتی خۆیـەتی و ئامـادە نییـە كـە ببێتـە هەویرێك هەر كەسێك بێت و بە ئارەزووی خۆی بیشێلێت...

ناظم ناصح

٢٠٠٨/٤/٢٢

سێ شەممە

# بەشی یەکەم

## ئەفکارە فەلسـەفییەکانی سەدەی نۆزدەم لە ئەوروپادا

سـەدەی نـۆزدەم سـەردەمی تەقینـەوەو پـەرش بـوونی فکـرەو ئایـدیای هەمــەجۆر بــوو لــە ئــەوروپادا، بــەجۆرێك دەتــوانین بڵــێین لــەدوای لەناوچوونی فەلسەفەی یۆنانییەکان بە سەدەها ساڵ پێش زایـین، دووبـارە لەسەدەی نۆزدەدا فەلسەفەی دەرکەوتنی بیرو هزرە هەمـەجۆرەکان سـەری هەڵدایــەوە لــەنێو ناوچــەکانی ئــەوروپادا. لــەم ســەدەمیەدا زۆرێــك لــە کەسایەتیە دیارەکـانی ئەوکاتـە لـە چـەند وولـاتێکی ئەورووپیـدا دەسـتیان خستە ناو دەستی یەکترو هەر یەکـەو لەبوارێك بیردۆزێـك یـان فکرەیـەکی نـوێی فەلسـەفی داهێنـا تـاوەکو بەیەکـەوە کولانـە ڕووخاوەکـەی فەلسـەفەی ئایدیایی دابڕێژنەوە...

* *کارل مارکس* (١٨١٨-١٨٨٣ز) لەو کاتەدا بەهاوبەشی لەگەڵ (*فریـدریك ئێنگلـز*) هەڵسـان بـە دارشـتنی مەنهـەجی مارکسـیزم و ماددەسـالاری کـە ڕێبازەکـەی ئـەوان هـیچ بایـەخێك بـۆ لایـەنی ڕوحـی و غـەریزی مـرۆڤ دانانێت و مادده بە ئەساسی هـەموو شـتێك دەزانێـت و دەڵێـت ڕوح وگیـان دروست بـووی دەسـتی مـاددەن. مارکسیەت ڕای وایـە کـە هـیچ شـتێك لـەم جیهانەدا جێگیر نییە، بەڵکو هـەموو شـتێك لـە گـۆڕان و پێشکەوتن دایـە، تەنانـەت دەڵێن عەقیدەو بیروباوەڕو دیـن و مێـژووش قابیلیـەتی گۆڕانیـان

هەیە. ڕێبازی مارکسیەت بە پلە یەك لەسەر بنـەمای ئـابووری (الإقتصـاد) دامەزراوەو بڕوای وایە کە گشت ناوەرۆکە یاسایی و سیاسی و ئاینییـەکان بەهۆی ژێرخانی کۆمەڵگاوە داهێنراون و ژێرخانیش واتە دەسـتی بەرهـەم هێنـەری کۆمـەڵگا. لـە فەلسـەفەی مارکسـیەتدا هەرچـی هەیـە لـە دیـن و دەوڵەت و قانون و سیاسەت و حکومـەت و بازرگانی و ڕێسا ئابوورییـەکان و زانست و هونەرو بنەما ئەخلاقیەکان و هەموو ئەمانـە پێیـان دەووتـرێ "سەرخان"(البناء الفوقي)، وە هـەروەها کارو چالاکی و هەڵسوکەوتەکانی نێو کۆمەڵگا لە مارکسیەتدا پێیان دەووترێ "ژێرخان"(البناء التحتي) کـە ئەمەیان وەکو هێزێکی بەرهەم هێنەرو ئینتاجی سەیری دەکـرێ، بـە پێـی بـیروڕای مارکسیەت گشت لایەنـەکانی سـەرخان بـە ئایینیشـەوە بـەهۆی چالاکی ژێرخانی کۆمەڵگاوە دروست بـوون، مارکسیەکان زۆر بـە کوێرانـە مامەڵـە لەگـەڵ واقیـع دەکـەن کاتێـك دەڵـێن دەقـە ئایینیـەکان و کتێبـە ئاسمانییـەکان لـە لایـەن کۆمـەڵگاوە داهێنـراون، بێگومـان ئەمـە تـەنها بانگەشەیەکی خەیاڵی بێ مانایەو هەرگیز لەسەر ئـایین جێبـەجێ نابێـت، چونکە ئەگەر ئەمە ڕاست بێت ئەوە دەبوایـە هـەر کۆمەڵگایـەك ئـایینێکی تایبـەت بـەخۆی هەبوایـە لەبـەر ئـەوەی ڕەفتـارو نـەریتی کۆمـەڵگاکان جیـاوازن و هـەر یەکـەیان بـە جـۆرێکن، بێگومـان ئەوکاتـە ئـایینی هـیچ کۆمەڵگایەك بۆ کۆمەڵگایەکی تر نەدەگونجا کەچی لە واقیعـدا پێچەوانەی ئەمـەمان بـۆ دەردەکـەوێ، مـارکس لـە ئـەڵمانیاو لـە نێـو کۆمەڵگایـەکی ئەوروپیدا جوولەکە بووەو لەسەر ئایینی یەهودییەت بـووە، لەکاتێکدا کـە ئـەم ئایینـە لـە نێـو کۆمـەڵگای میسـری کـۆن سـەری هەڵـداوە ئـیتر کـوا ژێرخـانی کۆمـەڵگای ئـەوروپی لـە داهێنـانی ئایینەکەیـدا؟ مەسـیحییەت ئـایینی زۆرینـەی خـەڵکی ئەوروپایـە ئایا گەوجایـەتی نییـە کـە بـووترێ

ژێرخانی کۆمەڵگای ئەورووپی دایهێناوە لەکاتێکدا کە مەسیحییەت لەنێو کۆمـەڵگای فەلەسـتین و ئۆرشـەلیم دا چـەکەرەی کـردووە؟ باشـە ئەگـەر کۆمەڵگا ئایینی داهێنابێت چۆن دەکرێ دەقـەکانی ئـایین دژی نەریتـەکانی کۆمـەڵگا بێـت؟ لـە کۆمـەڵگای نیمچـە دورگـەی عـەرەبی کۆنـدا نـەریتی بەکۆیلـە کـردن و هەوەسـبازی جـنس و شـەراب و نەویسـتنی منـداڵی کـچ دیارترین و باوترین سیمای ئەو کۆمەڵگایـە بـووە لەکاتێکدا کـە دەقـەکانی قورئـان زۆر بـە تونـدی دژی هـەموو ئەمانـە وەسـتاو تەنانـەت سـزای جەستەییشـی بـۆ هەنـدێك لـەم نەریتـە کۆمەڵایەتییانـە دانـا، ئەمـە لـە کاتێکدا ئەگـەر کۆمـەڵگا ئـەم ئایینـەی داهێنابێـت باشـە بۆچـی دەقـەکانی دژی نەریتـەکانی کۆمـەڵگا وەسـتایەوە؟. ئەگـەر ئەمـە ڕاست بێـت، دیـارە کۆمەڵگا داهێنان لە دژی خـۆی و نەریتـەکانی دەکات!. مـارکس کاتێـك لـە پێناسەی ئاییندا دەڵێت (ئایین تلیاکی گەلانە) مەبەستی ئەوەیە کە ئـایین وەکو تلیـاك وایـە بـە دەسـتی پیـاوانی ئـایینی و چینی چەوسێنەر بـۆ بـێ هۆشـکردنی چـینی بەنـدەو هـەژارو ئـەو مرۆڤـە مـاف خوراوانـەی نێـو کۆمـەڵگا کـە داوای گەڕانـەوەی مافـەکانیان دەکـەن، فەلسـەفەی مارکسـیەت ڕای وایە کە ئەخلاق و ئاکـارە جوانـەکان و بەهەشـت و ژیـانی دوای مـردن کە ئایین بانگەشـەی بـۆ دەکـات، هـیچ ئەسـڵ و ئەساسـێکی ڕاسـتییان نییـە بەڵکو تەنها بۆ فریـودان و بـێ هۆشـکردنی چینی بەنـدەو مـاف خـوراوانی نێو کۆمەڵگایە تاوەکو بە پێبەندی ئەخلاق و ئاکارەکان وایان تێ بگەیەنن کـە ڕێزگـرتنی پیـاوانی ئـایینی و گـەورەکان بەشـێکە لـە ئاکـارو ئەخلاقـە جوانـەکان و هـەروەها بـە مـژدەی بەهەشـت و خۆشـگوزەرانی ژیـانی دوای مـردن فریویـان دەدەن و بـێ دەنگیـان دەکـەن لـە داوا کردنـی مافـەکانیان بەمەش ئایینزاکان و چەوسێنەران هیچ بەربەستێکیان لەبەردەم نامێنێت

و پێگەی کۆمەڵایەتییان پارێزراو دەبێت و لەژێر چەتری ئایین دەست دەگرن بەسەر سەروەت و سامانەکان، ئەم پێناسەیەی مارکس بۆ ئایین ئەوەندە نارێك و شێواوە بەجۆرێك کە یەکەم جار دژی فەلسەفەکەی خۆیەتی، مارکس وا خۆی نیشان دەدات کە خەمخۆری چینی چەوساوەو بەندەکانە کەچی هەرخۆی بە داهێنانی سیستەمی سەرمایەداری و بازاڕی ئازاد زنجیری بەندایەتی خستە ملی چینی هەژارو کرێکارانی نێو کۆمەڵگا، مارکسیەت ڕای وایە کە ژیان لە تەنۆچکەیەکی ماددی مردووی نێو گڵ و زەلکاوەکان بە ڕێکەوت سەری هەڵداوەو قۆناغ دوای قۆناغ سەرجەم بوونەوەران لە یەکتریەوە دروست بوون. بەم جۆرە مارکسییەت لە ڕێبازێکی ئابوورییەوە بازی داو بووە بیردۆزێکی ئیلحادی وا کە بیروراکانی هەر لە ناو خودی خۆیدا دژی یەکن و نارێکن. بازاڕی ئازاد و سیستەمی سەرمایەداری (رأسمالية) پەسندکراوترین نیزامی کارە لەلای مارکس، بازاڕی ئازاد گەورەترین کارەساتی ئابووری بوو کە مارکسییەت بەسەر مرۆڤایەتیدا هێنا کە تاکو ئێستا لە چەندین وڵاتدا بە سیستەمێکی سەرکەوتوو ناسراوە بەڵام ئەگەر سەیری ڕووە ڕاستەقینەکەی بکەین دەبینین کە وانییە. هەر وڵاتێك سیستەمی بازاڕی ئازادی تیا پەیڕەو بکرێ ئەوە لەو وڵاتەدا چینی ناوەند لەناو دەچێ و نامێنێ، چینێك لەو پەڕی هەژاری دادەبێت و چینێکیش لە لووتکەی دەوڵەمەندی، ئەمە لەبەر ئەوەیە کە بازاڕی ئازاد لە مونافەسەی قازانجدا ئازادییەکی تەواو دەدات بە خاوەن کارەکان و ڕێگەیان دەدات کە لە مونافەسەدا مومارەسەی هەموو جۆرە ڕەفتارێك بکەن لە ڕووی دانانی نرخی کاڵاکان بە ئارەزووی خۆیان وئیحتیکارو قۆرخکردنی شتوو مەك و هەروەها گلدانەوەو قۆستنەوەی پرۆژە بیناکارییە پڕ خێرو قازانجەکان لە نێو

تەندەردا، بەمەش دوو چین دروست دەبێت کە چینێکیان لەبەر ئەوەی لە کـارو بازرگانیـدا شـارەزان یـاخود دارایـیەکی زۆریـان بـە دەسـتەوەیە لـە مونافەسەکەدا زۆر بەهێز دەبن و هەرچی پرۆژەو کارگەو بازرگانی پـڕ لـە خێرو قازانـج هەیـە بـۆ خۆیان کـۆنتڕۆڵی دەکـەن و بەمـەش دەچـنە سـەر لووتکـەی دەوڵەمەنـدی و ئـەو چـینەش کـە لـە مونافەسـەی کـاردا لاوازە دەکەوێتە چاڵی هەژاری و دەستی بە هیچ کارێك ناگات و تـەنها ئەوەنـدەی بۆ دەمێنێتەوە کـە وەکو کۆیلەو کرێکـار بـۆ ئـەو چینە دەوڵەمەنـدە کـار بکات کە لەژێر چەتری بـێ ویـژدانی مارکسدا نـانی ئەنانییـەت دەخـۆن و تـەنها بـە ووتـەی (إنمـا أوتیتـە علي علـم عنـدي) دەنـازن.. سەرچـاوەو مەرجـەعی سـەرەکی فکـری مارکسـیەت بریتییـە لـە کتێبەکـەی مـارکس بەناوی (*سـەرمایەداری*)و زۆرجاریش بـە پوختـەی مەنهـەجی مارکسـیەت دەووتـرێ *کۆمـۆنیزم* (الشـیوعیة).. لـەو کاتـەی کـە (تۆمـاس مـالثوس) ی ئابوریناسی بەریتانی لە توێژینەوەیەکی ئابوریدا پێشبینی ئەوەی کرد کـە ڕەنگە مرۆڤەکان بکەونە ڕکابەری و ململانێیەکی ترسناك لەگـەڵ یـەکتری لەسـەر دەسـتکەوتنی خـۆراك و بـژێوی ژیـان بـەهۆی ئـەوەی کـە ژمـارەی دانیشـــتوان زۆر بـــەخێرایی لـــە زیـــاد بووندایـــە و بـــڕی خـــۆراك و بەرهەمەکانیشـی بـەردەوام لـە کـەم بووندایـە، شـارلس داروپـن زۆر بـە پەرۆشـییەوە ئـەم پێشـبینییە ئابورییـەی وەرگـرت و گـەورەترین بنـەمای تیۆرەکەی خۆی لەسەر دارشت کە (ململانێ لە پێناو مانەوە) (الصراع مـن أجـل البقـاء) بـوو، داروپـن یاسـای ململانێـی لەسـەر هـەموو گیانـداران جێبەجێ کردو وای دانا کە سەرجەم گیانداران بە مرۆڤیشەوە هـەردەم لـە ڕکابەرییەکی سەخت دان لە پێناو دەستکەوتنی خۆراك و مانەوە لـە ژیـان، ئینجـا لـە ئەنجامـدا ئـەو گیاندارانـەی کـە بـە هێـزن لـە ڕکابەرییەکـەدا

سەردەکەون و لاوازو بێ هێزەکانیش بەرە بەرە کز دەبن و دەمرن بە هۆی دەست نەکەوتنی خۆراك، مارکس زۆر سەرسام و کارتێکراو بوو بەم فکرەیەو لەسەر ئەساسی ئەم ئایدیایە هەڵسا بە دارشتنی سیستەمی سەرمایەداری و بازاڕی ئازاد کە لەم سیستەمەدا ئازادییەکی تەواوی دەدا بە دەرەبەگ و دەوڵەمەندان و وای دانا کە چینی توانادار بە هەموو ڕێگایەك دەتوانێت سەرمایە بەدەست بهێنێت و ببێتە خاوەن موڵك بە حوکمی ئەوەی کە مارکس بڕوای بەو فکرەیەی هێگڵ و داروین و نیتچە هەبوو کە ڕایان وابوو ژیان و خۆشگوزەرانییەکانی بەرهەمی ڕکابەرییەکی سەختن و ئەو کارایەش کە لەم ڕکابەرییەدا ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێت بریتییە لە هێز. ئەم فەلسەفە ڕەشەی مارکس گەورەترین قەیرانی ئابووری بەسەر چینی هەژارو کرێکارانی ئەوروپا داهێنا، کرێکاران زۆر بە بێ ویژدانانەو بە مووچەیەکی زۆر کەم کاریان پێ دەکراو ڕێژەی مردنیان زۆر بوو لە نێو کارگەکاندا بە هۆی قورسی کارەکانیان، ئیتر دوای ئەمە و بەرە بەرە دەنگی ناڕەزایی چینی کرێکار لە هەموو لایەك بەرز دەبووەوە تا لە سەرەنجامدا گەورەترین شۆرشی پیشەسازی لە فەرەنسا سەری هەڵدا لە دژی چینی ئەرستوقراتی بورژوازی کە ئەمانە بە هاوڵاتی پلە یەك هەژمار دەکران، لەم سەرو بەندەداو لە نێو ڕووداوەکانی ئەم جیهانە شێواوەدا ڕێبازی سۆشیالیزم سەری هەڵدا لە دژی سیاسەتی چینایەتی و بازاڕی ئازاد و سیستەمی سەرمایەداری..

* *(سۆشیالیزم)* بە مانای کۆمەڵ سالاری دێت، ئەم ڕێبازە دەرئەنجامی ئەو کاردانەوەیەی سەدەی نۆزدەم بوو کە لەدژی چەوسێنەرانی بورژوازیەت بەرپا بوو کە لە لایەن ئەوانەوە چینی کرێکار زۆر بە سەختی مامەڵەیان لەگەڵ دەکراو دەچەوسێنرانەوەو مووچەکەیان

ئەوەندە کەم بوو کە هەر بەناو مووچە بوو بۆ ئەوەی پێیان بووترێ کرێکار ئەگینا لە هەموو ڕوویەکەوە مامەڵەی بەندایەتییان لەگەڵ دەکرا، ئەوروپا لەو سەردەمەدا کڵپەی گڕی دەرەبەگایەتی لەسەر بەرز دەبویەوە بە هۆی ئەوەی کە لە جیاتی بەزەیی و بەخشین و تەنازول کردن بۆ هەژاران لە موناقەسەی قازانجدا دەستیان دابووە پەیڕەو کردنی سیستەمی بازاڕی ئازادو سەرکەوتنی بە هێزەکان. سۆشیالیزم هەندێ جار پێی دەووترێ (الإشتراکیة) واتە (هاوبەشێتی) چونکە داوای ئەوە دەکات کە دەبێت سامانە نەتەوەییەکان هەژارو دەوڵەمەند لێی هاوبەش بن بە بێ جیاوازی، سۆشیالیزم دژی حوکمی تاك ڕەوەو هەوڵ دەدات حوکم لەدەستی تاك دەربێنێت و بیداتە دەستی کۆمەڵگا. هەروەها سەرمایەو ماڵ کەڵەکە بووی دەستی دەوڵەمەندان نەبێت و تەنها لە نێوان زەنگینەکان نەخولێتەوەو هەژارانیش تەنها سەیر بکەن. ئەمە خاڵێکە کە سۆشیالیزم بە پلە یەك لە پێناویدا دامەزرا کەچی قورئان بە سەدەها ساڵ بەر لەمە باسی ئەم بابەتەی کردووە کە دەڵێت (کي لا یکون دولة بین الأغنیاء منکم) واتە سامانەکان نابێت تەنها لە دەست دەوڵەمەندەکانتان دابێت.

* هەر لە سەدەی نۆزدەدا لە ئەلمانیا (هێگڵ) و (نیتچە) بە دوو ڕێبازی جیاوازی فەلسەفی هاتنە ناو مەیدانی ئایدۆلۆجیا داهێنراوەکان. بیروڕاکانی هێگڵ بناغەیەکی پتەوی ڕێبازی مارکسیزم بوو چونکە هێگڵ لای وابوو کە مرۆڤ لە مادده زیاتر هیچی تر نییە، مارکس لە چەسپاندنی تیۆرەکەیدا زۆر سوودی لە ئایدیاکانی وەکو ماددیەتی دیالێکتیکی و ماددیەتی مێژوویی وەرگرت کە فەلسەفەکەی هێگڵ بە ڕوونی بانگەشەی بۆ دەکرد، لە گەنجایەتیدا هێگڵ ئەوەندە خولیای ئەدەبیاتی یۆنانی ببوو بە جۆرێك کە ڕەوشت و ڕەفتارەکانی کۆمەڵگای یۆنانی کۆن یەکجار

سەرسامی کردبوو کە تا کۆتاییـەکانی ژیـانی کاریگـەری ئـەدەبیاتی یۆنـانی لەسـەردا بـەدی دەکـرا، هێگـڵ لـە ماوەیەکـدا وای لێهـاتبوو کـە ئـاییـنی یۆنانییـەکانی بـە پەسـندتر دەزانـی لـە ئـاییـنی مەسـیحییەت و تەنانـەت هەڵسـا بـە نووسـینی کتێبێـك کـە تیایـدا بـە ڕاشـکاوانە موعجیزەکـانی مەسیحی بە درۆ دەخستەوەو ڕەتی دەکردەوە کە مەسیح کوڕی خـوا بێـت بـەڵکو بـە مرۆڤێکـی ئاسـایی و بـە کـوڕی مەریـەم و یوسـفی ناسـری لـە قەڵەمی دەدا، بەڵام دواتر لە بڵاو بوونەوەی ئەم کتێبە ترساو لەناوی بـرد. کاتێـك لـە ڕووداوەکـانی ژیـانی هێگـڵ وورد دەبینـەوە دەبیـنین هێگـڵ کەسایەتییەك بووە زۆر بە خێرایی بڕیاری لەسەر شتەکان داوە هەر بۆیـە شێواوی و ناڕێکییەکی زۆر لە بیرو ڕاکانیـدا دیـارە، بـە پێـوەری ئـەدەبیات ئاییـنی مەسـیحییەتی ڕەت کـردەوەو کتێبێکـی لـەدژی نووسـی کـە ئەسـڵەن ئەمە بڕیاردانێکی سەرسەختانەی خێرایە کە بڕیارێکی خێراتری بـەدوای خۆیدا هێنا ئەویش لەناو بردنـی کتێبەکـەی بـوو، هـەروەکو چۆن زۆر بـە خێرایی بڕیاری دا کە واز لە وانە ووتنـەوە بهێنێت پاش ئـەوەی کـە (١٥٠٠) دۆلاری لە دوای مردنی باوکی بۆ مایەوەو بەمە هەستی بەوە کرد کـە بـەم بـڕە پارەیـە دەوڵەمەنـد بـووەو ئـیتر پێویسـتی بـە وانـە ووتنـەوە نـەماوە. هێگڵ لە سەرەتادا ڕای وابوو کـە جـەرب و ڕکابـەری و بـەکار هێنـانی هێـز گەورەترین فاکتەری بەرەو پـێش چـوونی کۆمەڵگاکانـە بـەڵام پـاش چـەند سـاڵێك لـەم ڕایـە پاشـگەز بوویـەوەو بانگەشـەی هـێمنی و ئاشـتی دەکـرد، کەسێك کە لە گەنجایەتیدا بانگەشەی توندو تیژی و هێـز بکـات پاشـان لـە پیریدا پەشیمان ببێتـەوەو هێمنی و ئاشـتی پەسـند بکـات بێگومـان لەبـەر ئەوەیە چونکە لە کاتی بەساڵاچووندا مـرۆڤ زیـاتر پێویسـتی بـە هـێمنی و ئـارامی هەیـەو قـەدری ئاشـتی دەزانێـت هـەر بۆیـە هێگـڵ هەڵسـا بـە

شـاردنەوەی زۆربــەی ئـەو نووسـینانەی خـۆی کـە بانگەشـەیان بـۆ بـەکار هێنانی هێز دەکرد،. هێگڵ قسەیەکی وای کرد کە هیچ مرۆڤێك پێش ئـەو نەوێراوە ئەم قسەیە بکات و کەسیش لە دوای ئەو، جورئەت ناکات شتێکی وا بڵێت ئەویش ئەوە بوو کە ووتی (ئەگەر مـاددە ئەندامییـە پێویستەکان و ئاوو کاتێکی زۆرم پێ بدەن من مـرۆڤێك دروست دەکەم!).

ئەمە ئەوپەڕی بەدوور زانینی ڕوحە لە لاشـەو پەسـند کردنـی مـاددەی ڕەق و بێ هۆشە بەسەر غەریزە زیرەك و هۆشیارەکانی مرۆڤ. هێگڵ بۆیـە وا بە متمانە بە خۆ بوونەوە ئەم قسەیە دەکات چونکە لای ئـەو مـرۆڤ لـە چـەند ماددەیـەك پێکهـاتووەو بـەس. ئـیتر بـڕوای بـەو هـەموو غـەریزە زیـرەك و هۆشـیارانە نییـە کـە لـە مـرۆڤ دا هـەن وەکـو خۆشەویسـتی و بەزەیی و یارمەتی و کارامەیی و چەندان غەریزەی تری ڕوحـی کـە هێگڵ بەچـاو دەیـدیتن بـەڵام بـە دڵ خـۆی لـێ کـوێر دەکـرد. هێگـڵ ئـەو دروسـتکارەی سـەردەمی عەولەومـە بـوو کـە نەیـدەتوانی یـەك گـەردی پرۆتینی بەچاو ببینێ نەك مرۆڤێك دروست بکـات ئیـدی چۆن دەیتـوانی غەریزەی سۆزو خۆشەویستی بخاتـە دڵـی ئـەو مرۆڤـەی کـە ئـەو دروسـتی دەکات تاوەکو لە شەوەزەنگە سارد و سامناکەکانی زستاندا کۆرپە سـاواکەی لـە بـاوەش بگـرێ. بێگومـان ڕوح جووڵێنـەری غـەریزەو ئەندێشـەکانی مرۆڤـەو ئـەو غەریزانـەش جووڵێنـەری پێکهاتـە ماددییەکـەی جەسـتەی مرۆڤن و ئینجا بـە جوولـەی جەسـتەو ئەندامـەکان کـە ئەمانـە پێکهاتـەی ماددین مرۆڤ کارەکانی ئەنجام دەدات ئـەگینا جەسـتە بـەبێ بـوونی ڕوح و غـەریزەکان هـیچ بایـەخی نییـەو توانـای هـیچ داهێنـانێکی نییـە چـونکە ئەگەر تەنها ماددەو جەستە ئەساس بێت ئەوا دارو بەردو ئاسـن و سـەگ و مشـك و هـەموو ئەمانـە جەسـتەیەکی ماددیـان هەیـەو دەجـووڵێن بـەڵام

لەبەر نەبوونی ڕوح و غەریزە زیرەکەکان توانای هیچ کار و داهێنانێکیان نییە.. نموونەی ئەم بانگەشەیەی هێگڵ کە گوایە دەتوانێت مرۆڤێك دروست بکات وەك نموونەی ئەو منالّە ساوایە وایە کە لە سەر کاغەزی وێنە کێشانەکەیدا لە ڕێگەی دروستکردنی بازنەیەك و چەند خەتێکی تێکەڵ و پێکەڵ وێنەی بووکەڵەیەکی شڕو پڕو ناڕێك دەکێشێت و واش خەیاڵ دەکات کە وێنەیەکی زۆر جوانی کێشاوە، بێگومان ئەگەر مادده ئەندامییە پێویستەکان و ئاوو کاتێکی زۆریش بۆ هێگڵ دابین بکرابا هەروەك خۆی داوای دەکرد ئەوا لە دوای بەفیڕۆ دانی ئەم کاتە زۆرە ئەنجامەکەی هەر ئەوە دەبوو کە پەیکەرێکی ناڕێکی لەسەر شێوەی ئادەمیزاد لە قوڕ دروست دەکردو وەکو منالّەکە وای خەیاڵ دەکرد کە مرۆڤێکی دروست کردووە!.

دڕندانەترین فکرەی فەلسەفی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بە مێشکی هێگڵ داهات ئەویش ئەوە بوو کە دەیووت پێویستە لە پێناو باشکردن و چاك کردنی وەچەی مرۆڤایەتیدا گشت مرۆڤە کەم ئەندام و پەك کەوتەکان و ئەوانەی کەم و کوڕی لاشەییان هەیە بە زووترین کات بکوژرێن و نەمێنن چونکە لای وابوو کە ئەمانە مندالّی کەم ئەندام و ناتەواویان دەبێت و دەبنە هۆی زیاد بوونی مرۆڤی ناتەواوو بەمەش کۆمەڵگا تێك دەچێت!. جارێ بەر لەهەموو شتێك لەبەر ئەوەی هێگڵ ماددیەکی زۆر پەل و سەرسەخت بووە هەرگیز بیری لەوە نەکردۆتەوە کە ناتەواوی لاشەیی دوو جۆرە، یەکێکیان ئەو جۆرەیە کە مرۆڤەکە لە دوای لەدایك بوونی بە هۆی زەبرێك یان هۆکارێکی دەرەکی تووشی دەبێت کە ئەم جۆرە ناتەواوییە هەرگیز ناگوازرێتەوە بۆ منالّەکان چونکە ئەو جۆرە ناتەواوییانەی کە بەهۆی ڕووداوێك یان کارتیاکەرێکی دەرەکی تووشی

مرۆڤ دەبێت بەهیچ شێوەیەك وەكو زانیاری لەسەر شریتی گەردەكانی ترشەلۆكی ناوەكی ناو خانە (الحامض النووي) تۆمار نابن كە بەرپرسیارن لە گواستنەوەی سیفاتە جەستەییەكان لە باوانەوە بۆ وەچەكان، چەندان كەس هەن كە بەهۆی ڕووداوێكەوە كوێر یان كەڕ و لاڵ و پەك كەوتە بوون بەڵام نەوەكانیان هەرگیز ناتەواوییەكیان تیا بەدی ناكرێ.

جۆری دووەمیان ئەو ناتەواوییەیە كە بە زگماك و بۆماوە مرۆڤەكە تووشی هاتووە، ئەم جۆرەیان دەگوازرێتەوە بۆ نەوەكان بەڵام چارەسەری مرۆڤانەتری هەیە نەك كوشتن. با نموونەیەك وەربگرین، ئەگەر كەسێك كەموكوڕی لە ئەندامێكی جەستەی هەبێت كە بە بۆماوە وەری گرتبێ لە باوانییەوە ئەوا بە پێی زانستی بۆماوەزانی واچاكە بەدوای هاوسەرێكی وا بگەڕێت كە لە خێزان و عەشیرەتەكەیدا هیچ كەم وكوڕییەك لەو ئەندامە نەبێت كە ئەویتر كێشەی لێ هەبوو، لەم بارەدا ئەگەری ئەوە هەیە كە لە كاتی یەكگرتنی جینات و كرۆمۆسۆمەكان دا سیفەتە ناتەواوەكە بەزیو بێت و سیفاتە تەواوەكەی ئەویتریان زاڵ بێت و لەم حالەتەشدا وەچەیەكی بێ عەیب لەدایك دەبێت و ناتەواوییەكە بنەبڕ دەبێ و نامێنێت. یاخود ئەگەر ئەو چارەسەرەی باسمان كرد ئەویش سوودی نەبوو ئەوا هەر نابێت بیر لە كوشتنی بكرێتەوە بەڵكو لە دوا قۆناغی بێ ئومێدی دا دەتوانرێ بە نەشتەرگەری پزیشكی (قطع الإنجاب) ی بۆ بكرێت واتە نەهێڵرێ منداڵی ببێت ئەمە لە حاڵەتێكدا كە ئەگەر بێتوو كەسەكە هەڵگری نەخۆشی مەترسیداری بۆماوەیی بێت. هێگڵ دەیووت بە كوشتنی كەم ئەندامان كۆمەڵگا پاك دەبێتەوە بەڵام خۆی لە حەقیقەتدا كۆمەڵگا پێویستی بەوە بوو كە لە كەسانی وەكو هێگڵ و هاوشێوەكانی پاك بێتەوە چونكە كەسێك كە ئەم جۆرە بیرو ڕایەی

هـەبێت بێگومـان عـەقل و عەقیدەکـەی لەوپـەڕی کـەم ئەنـدامێتی دایـە. هێگـلّ بـە زمـانی فەلسـەفە و قەلـەم ئـەم پێشـنیارە ڕەشـەی کـرد بـەڵام *(هیتلەر)* بە زمانی کوشتن و چەك جێ بـەجێی کـردو ڕەشـترین مێـژووی بۆ ئەڵمانییەکان نووسییەوە کاتێك سەدەها کەم ئەندامی بنەبڕ کرد لەسەر فکرەکەی هێگلّ. لەساڵی (١٩٤١ز) لە گەرمەی جەنگی جیهانی دووەمـدا بـە بڕیاری هیتلەر، نازییەکان هەڵسان بـە بڵاوکردنـەوەی چەند ڕاگەیانـدنێك لە هەندێ شارەکانی ئەڵمانیا بە تایبەتی لە ناوچە جوولەکە نشینەکان کـە دەیانووت هەر خێزانێك ئەگەر مرۆڤی کـەم ئەنـدام و ناتـەواوی هەیـە بـا بیهێنێت بۆ ئەوەی چارەسـەری تەندروسـتییان بـۆ بکرێـت، بـەم فریودانـە سەدەها کەم ئەندامیان کەوتە بەر دەست و هەموویانیان خستە ناو چەند ژوورێکی داخـراو کـە لـەم ژوورانـەدا چـەند بۆڕییـەکی کـراوە هێنـرابوونـە ژوورەوەو ئەم بۆڕییانە لە دەرەوە بەسـترابوون بـە چـەند بـوتڵێکی پـڕ لـە گـازی یەکۆکسـیدی کـاربۆنی ژەهـراوی کـە بـە بـەکارهێنانی ئـەم گـازە ژەهراوییـە تـەواوی کـەم ئەندامـەکانیان کوشـت و لـەناو بـرد!. بێگومـان بەرپرسیاریەتی ئەو تاوانـە مێژووییـە دڕندانەیـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی کە هیتلەر بڕوایەکی پتـەوی بـە مەزهەبـە ماددییـە ئیلحادییەکـەی هێگـلّ هەبوو.. لەوکاتـەی کە لـە سـاڵی (١٨٣١ز) نەخۆشـی کۆلێرا وەکو پەتایـەك ناوچـەکانی ئـەڵمانیای گرتــەوە بــە تایبــەتی بــەرلینی پایتــەخت، ئــەو فەیلەسـووفەی بانگەشـەی ئـەوەی دەکـرد کـە دەتوانێـت مرۆڤێـك دروسـت بکات نەیتوانی خۆی ڕابگرێت لـە بەرامبـەر هێرشی نەخۆشـییەکەو بـەرە بــەرە نیشــانەکانی کــۆلێرای لــێ دەرکــەوت تــا لــە هــەمان ســاڵدا بــەم نەخۆشـییەوە چـۆکی بەرامبـەر مـەرگ بـە زەوی داداو بـە ناچـاری ئـەو ڕوحەی لێ سەنرایەوە کە هەرگیز ئیمانی بە هەبوونی نەبوو...

★ هەروەها (نیتچە) ئەو فەیلەسووفە تـووڕەو تونـدە ئەڵمانییە بـوو کـە تـەنها شارسـتانییەتی دوور لـە ئـایینی لا پەسـند بـوو، لـە منداڵیـدا زۆر پەیوەست بوو بە دەقەکانی ئایینی مەسیحییەت و ڕێنماییـەکانی مەسـیح بە جۆرێك کە لە نێـو هاوتەمەنەکانیـدا وەکـو ووتـارخوێن و بـانگخوازێکی ئایینی دەردەکـەوت و هـەردەم ڕەخنـەی تونـدی لـە ڕەفتـارە ناشیرینەکانی دۆستانی دەگرت تا وای لـێ هـات بـەوە وەسفیان دەکـرد کـە وەکـو مەسـیح وایە لە پەرستگا، بەڵام لـە گەنجایەتیـدا بـووە دوژمـنی ئـایین و بـە تونـدی هێرشی کردە سەر مەسیحییەت و لە نـاوەرۆکی فەلسـەفە هەڵگەڕاوەکەیـدا بانگەشـەی ئـەوەی دەکـرد کـە (خـوا مـردووە)!. نیتچـە ڕای وابـوو کـە ڕێنماییـە ئەخلاقیـەکانی مەسـیحییەت و موعجیزەکـانی مەسـیح تـەنها ئەفسانەن و ڕێگرن لەبەردەم پێشکەوتنی عەقلی و فکری کۆمـەڵگاکان، بـە تەواوی لە مەسیحییەت بێزار ببوو، تەنانەت زەنگی کڵێسا بێزاری دەکـردو ڕقی لێ بوو، دەیووت چۆن دەکرێ ئەو زەنگ لێدان و مەراسیمە ئایینیانـە لە پێناو جوولەکەیەکدا بکرێ کە دوو هەزار ساڵ پێش ئێستا دەیـووت مـن کوڕی خوام!.

هێگـڵ و نیتچـە عەقلانیـەتێکی زۆر سەرسـەختیان هـەبوو بەتایبـەتی نیتچـە تـوڕەو توندییـەکی بـەردەوامی هـەبوو لـەبارەی هەنـدێك لـە مەسەلەکان، نیتچە لە ژیانی فەلسەفیدا زۆر کاریگەر ببوو بە بـیرو ڕاکـانی (داروین) و سیاسـەتە توندڕەوەکـەی (پسمارك) و کتێبـە فەلسـەفییەکەی (شۆپنهاوەر) بە جۆرێك دەتوانین بڵێین لە کێڵگەی ئەم سێ کەسایەتییەدا تۆوی فەلسەفەکەی نیتچە چەکەرەی کرد. کتێبەکـەی شۆپنهاوەر (جیهـان وەکـو فکـرەو ئـیرادە) وای ڕادەگەیانـد کـە گشـت جوولـەو کـردارو چـالاکییەکانی مـرۆڤ لـەم جیهانـەدا تـەنها لـە ژێـر ئـیرادەی خۆیـەتی و

ئیرادەی مرۆڤ لە سەرووی هەموو شتێکە، بیرو ڕاکانی ئەم کتێبە وای لە نیتچە کرد کە زۆر بە قووڵی بەنێو ژیانی فەلسەفیدا بچێت. نیتچە دەیووت لە کاتی خوێندنەوەی کتێبەکەدا وام دەزانی کە شۆپنهاوەر ڕاستەوخۆ بیرو ڕاکانی ئەم کتێبە ئاراستەی من دەکات. هەروەها تیۆری (ململانێ لە پێناو مانەوە) کە داروین بانگەشەی بۆ دەکرد گەورەترین کاریگەری لەسەر بیرکردنەوەکانی نیتچەدا هەبوو، لە ژێر تیشکی ئەم فکرەیەی دارویندا نیتچە ڕای وابوو کە ڕکابەری و کوشتارو بەکارهێنانی هێز لە نێو گەلانی دونیاو زاڵ بوونی بەهێزەکان مافێکی سروشتی و ڕەوایە چونکە سروشت بڕیاری لەسەر داوە، ڕێڕەوی فەلسەفەکەی نیتچە ڕەنگدانەوەیەکی ئاشکرای ئەو سیاسەتە خوێناوییەی (پسمارك) بوو کە دەیووت کێشەو ناکۆکییەکانی ئەمرۆی نێوان وولاتان نابێت بە دیموکراسییەت و دەنگدان و گفتوگۆ چارەسەر بکرێ بەڵکو خوێن و ئاسن حوکمی بەسەردا دەکات!، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەو لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا کاتێك سووپای ئەڵمانیا لە ڕووی هێزی چەکداری و عەسکەرییەوە گەیشتبووە لووتکەی توانا سەربازییەکانی، ئەم سووپایە پێویستی بە پشتیوانێکی مەعنەوی هەبوو بۆ داڕشتنی چەند دروشمێکی خوێناوی لە پێناو ڕەواکردنی کوشتارو زاڵ بوون بەسەر گەلانی دونیا، بێگومان ئەو بیرو ڕایانەی کە نیتچە لە فەلسەفەکەیدا بانگەشەی بۆ دەکرد گەورەترین پشتیوانی فکری بوو بۆ پێکانی ئامانجەکانی نازییە ئەڵمانییەکان چونکە فەلسەفەکەی نیتچە لە ژێر کاریگەری بیردۆزی (ململانێ لەپێناو مانەوە) ی دارویندا، ڕای وابوو کە میللەتە زلهێزەکانی دونیا بە هەموو جۆرێك بۆیان هەیەو مافی خۆیانە کە هێز بەکار بهێنن لە پێناو بەدی هێنانی ئامانجەکانیان و زاڵ بوون بەسەر میللەتانی تر،

چونکە سروشت وای بڕیار داوە کە سەرکەوتنی بەهێزەکان و زاڵ بوونیان بەسەر بێ هێزەکان گەورەترین فاکتەرە بۆ پەرەسەندن و بەرەو پێش چوونی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، بەم جۆرە نیتچە بووە ڕابەرێکی مەعنەوی بۆ هەڵگرتنی ئاڵاو دروشمە سەربازییەکانی سووپای ئەڵمانیای نازی بە جۆرێك کە دەنگی فەلسەفەکەی لە نێو بڵندگۆی نازییەکاندا وەکو هوتافی سەربازی دەنگی دەدایەوە. هەر لەبەر ئەمەشە کە نیتچە بە باوکی ڕوحی نازییەکان دادەنرێ چونکە بیرو باوەڕی نیتچەو ئاواتەکانی هیتلەر ڕێك لەگەڵ یەکتر یەکانگیر بوون بۆیە خۆشەویسترین جێگەی لەدڵی نازییە ئەڵمانییەکان دا هەبوو. فەلسەفەی نیتچە باوەڕی وایە کە دەبێت هەردەم لە مەترسی و ترسناکیدا بژین و لەسەر لێواری مەترسی دا بین، لە کەسایەتی هیتلەریشدا دەبینین کە هیتلەر هەردەم جوولەکەکانی بە مەترسییەکی گەورەو ترسناك دادەنا. مەرگەساتی هۆلۆکۆست کە هیتلەر خولقاندی دەرئەنجامی ئەو مەترسییە بوو. ئەگەر گەلی جوولەکە فیرعەون و وەزیرەکەیان بە چاوی خۆیان نەدیوە *(فرعون وملأە)*، با سەیری هیتلەرو نیتچە بکەن کە وەکو (فرعون وملأە) لێیان هەڵسانەوە! فرۆیدیش وەکو سامرییەکی نوێ بۆ گەلەکەی خۆی (یەهود)، دەستی بە بنیات نانی عیجلی سێکس کرد لە ڕوانگەی دەروون شیکاریدا...

★ هەر لەو سەردەمەدا لە ئەوروپا، قوتابخانە دەروون شیکارییەکەی (سیگمۆند فرۆید) سەری هەڵدا کە لەژێر تیشکی بابەتەکانی دەروون ناسیدا، هەوڵی دەدا ڕەفتارو هەڵچوونەکانی مرۆڤ شی بکاتەوە. فرۆید لە ئەنجامی تێڕوانینی وورد لە نەخۆشەکانی، چەند دۆزینەوەیەکی گەورەی دەروونی دەرخست کە بەناوبانگ ترینیان دۆزینەوەی (ژیری نەست) بوو واتە (العقل اللاشعوري). لەم دۆزینەوەیەدا فرۆید ئەوەی دەرخست کە

جگە لەو عەقلەی مرۆڤ هەیەتی کە بەکاری دەهێنێت بۆ کارکردن و بیرکردنەوەکان، عەقلێکی تری هەست پێ نەکراوی هەیە کە هەرکاتێك ئەم عەقلە بکەوێتە کار بە ئارەزووی خۆی مرۆڤ دەجوولێنێت و قسەی پێ دەکات. بۆ نموونە هەندێك جار مرۆڤ لەکاتی نوستن دا دەڕوات و قسە دەکات بە بێ ئەوەی ئاگاداری خۆی بێت. ڕێبازە دەروون شیکارییەکەی فرۆید لە زۆر بواردا سوودی گەیاند بەڵام گەورەترین هەڵە کە فرۆید تێیدا کەوت ئەوە بوو کە دەیووت غەریزەی جنسی گەورەترین پاڵنەرو ئاواتی مرۆڤە، فرۆید ڕای وایە کە پاڵنەری جنسی سەرچاوەی هەموو ڕەفتارو هەڵچوونەکانی مرۆڤەو بەپێی بیرو ڕای فرۆید مرۆڤ هەر لە یەکەم ڕۆژی لەدایك بوونیەوە وەکو ئاژەڵێکی جنسی لەدایك دەبێت، بێگومان ئەمە فریودانێکی عەقلی زۆر ترسناکەو هیچ بنەمایەکی ڕاستی نییە لە ڕوانگەی زانستدا چونکە ئاستی غەریزەکان لە مرۆڤدا هەموویان یەکسانن و هەریەکەیان لەکاتی پێویستدا بەهێزتر دەبێت لەوانی تر. بۆ نموونە لەکاتی برسێتیدا غەریزەی خواردن لە هەموویان بەهێزترە یاخود لە کاتی ترس و شەڕدا غەریزەی خۆپاراستن لەهەموویان بەهێزترە، ئینجا لە کاتی ڕەخسانی بارێکی گونجاوی ئارام دا غەریزەی جنسی لە هەموویان بەهێزتر دەبێت. چەندین جار بینیومانە لەکاتی دەربەدەر بوون و هەڵاتنی میللەتێکدا چەندین کوڕو کچی گەنج بە تەنیشت یەکەوە ڕا دەکەن کەچی هیچ یەکێکیان بیر لە شەهوەتی جنسی ناکاتەوە چونکە لەم کاتانەدا ترسان و برسێتی دەست بەسەر هەڵچوونەکانیان دا دەگرێت. فرۆید شتێکی زۆر سەیری باس دەکرد کە دەیووت کۆرپەی ساوا کاتێك شیردانی دایکی یان پەنجەی خۆی دەمژێت لەو کاتەدا بەم مژینە هەستی جنسی خۆی تێر دەکات!. جارێ بەر لە

هـەموو شـتێك كۆرپـەی ساوا لەبەرئـەوەی برسـیەتی بۆیـە داوای شـیردانی دایكـی دەكـات كـە ئەگـەر بێتـوو شـیری دایـك ووشـك بێـت و نـەمێنێت كۆرپەكـە بـە گریانـەوە فرێـی دەدات و غـەریزەی جنسـی لای ئـەو هـەر هەستیشی پـی نـاكرێ. دواتـر ڕاسـتەقینە ئـەوەمان بـۆ دەسـەلمێنێت كـە غـەریزەو شـەهوەتی جنسی لـە قۆنـاغی منداڵێتیـدا هـەرگیز چالاك نییـە ﴿أَوِ ٱلطِّفۡلِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يَظۡهَرُواْ عَلَىٰ عَوۡرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ﴾، لـــــە ســـــەرەتاكانی یەهودییەتدا (سامری) هات و گوێرەكەی بـۆ گەلی جوولەكە هێنـا، بـەڵام فرۆید لە سەدەی نۆزدەدا هات و (سێكس) ی بۆ هێنان و كردییە چەكێكی كـارا بـۆ دەســتەمۆ كردنــی گــەلانی جیهـان. بـیرو ڕاكـانی فرۆیـد زۆر مەترسـیدارە لەسـەر كۆمـەلگای مرۆڤایـەتی چـونكە دەرونزانـی دەكاتـە پشتیوانێك بۆ ئەوەی وا لە مرۆڤ بگەیـەنێت كـە بەهـەموو ڕێگەیـەك بـۆی هەیە وەكو ئـاژەڵ هەڵسێت بـە تێركردنـی ئـارەزووە سێكسییەكانی و ڕای وایـە كـە ئەگـەر شـەهوەتی جنسـی ڕێگـری لـێ بكرێـت و كـپ بكرێتـەوە (الكبت)، ئەوا ئەم حاڵەتە گەورەترین هۆكـارە بـۆ دروسـت بـوونی ئـایین و ئەخلاق كە لەدواتردا ئەم دووانە دەبنە گەورەترین ڕێگر لەبەردەم ئازادی سێكسی. زانا سەهیۆنییەكان هەسـتیان بـەگرنگی ئـەو سێكسـە كردبـوو كـە فرۆیـد باسـی لێـوە دەكـرد هـەر بۆیـە هەڵسـان بـە داڕشـتنی پرۆتۆكـۆلێكی تایبەت بە سێكس و عەقیدەكانی فرۆید كە دەڵێن: (فرۆیـد لـە ئێمەیـە و بنـــەماو پەیوەندییـــە سێكســـییەكان بـــە ڕوونـــی نیشـــانی خـــەڵك دەدات بـەجۆرێك كـە ڕەوشـتی گـەنجان دادەڕووخـێ و هـیچ شـتێكی پیرۆزیـان لـە مێشكدا نامێنێ و سێكس دەبێتە گەورەترین ئاواتیان، بەمـەش ئێمـە هـیچ بەربەستێكمان لەبەردەم نامێنێت(...)

ئەوروپا لەو سەدەیەدا نوقمی نێو لماوی چەندین فەلسەفەو تیۆری جۆراو جۆر ببوو بە دەست ئەوانەی کە ناومان بردن و زۆرانی تری وەکو (شۆپنهاوەر و پێلخانۆف و مۆسۆلۆنی و ستالین و لینین و هکسلی و لامارك و بلانکی) و چەندانی تر کە هەموویان بە لێخوڕی شەمەندەفەری فەلسەفە و ئایدیا هەمەجۆرەکان دادەنرێن لە ئەوروپادا.

★ هەر لەم سەدەیەدا ئابووری ناسێکی بەریتانی بە ناوی (تۆماس مالثوس) لێکۆڵینەوەیەکی ئابووری بڵاوکردەوە کە تیایدا هۆشداری ئەوەی دابوو کە (ژمارەی دانیشتوان بە بەردەوامی زیاد دەکات و بڕی خۆراکیش بەردەوام کەم دەبێتەوە). ئەم لێکۆڵینەوەیە مەترسی ئەوەی داهێنا کە ئەگەر خۆراك کەم بکات و ژمارەی مرۆڤەکان زیاد بکات ڕەنگە شەڕانگێزی و ڕکابەرییەکی توند لە نێوان مرۆڤەکان سەر هەڵبدات بۆ دەست کەوتنی خۆراك و لەئەنجامدا بێ هێزەکان هەموویان دەمرن. زانا ماددییەکانی ئەوروپا بەبێ ئەوەی ئەوە لەبەرچاو بگرن کە مرۆڤ لەکاتی تەنگانەدا گیانی بەزەیی و هاوکاری تێدا هەیەو وەکو ئاژەڵ نییە یەکسەر پێشبینی ڕوودانی ئاژاوەو کوشتاریان کرد لە نێوان مرۆڤەکان. بیریارە ئەوروپییەکان لە ژێر تیشکی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا بە باشیان زانی کە ژمارەی دانیشتوان کەم بکەنەوە لە ڕێگەی ناردنی (منداڵەکان و نەخۆشەکان و بێ هێزەکان) بۆ کارە قورسەکان و کارگە ترسناکەکان تاوەکو ئەوانە بەر لە ڕوودانی ململانێ بمرن و لەناو بچن و ژمارەی دانیشتوان کەم بێتەوە، بێگومان ئەمە لە زۆر ناوچەی ئەوروپادا جێ بەجێ کرا کە تاوەکو ئێستاش کرێکارەکانی ئەوروپا بە هۆی پاشماوەی ئەو کارە ڕەشە نامرۆڤانەیە دەناڵێنن. لە کارگە پیشەسازی و پرۆژە بیناکارییەکانی ئەوروپادا کرێکارەکان زۆر بە سەختی مامەڵەیان لەگەڵ

دەکـــرێ و ڕێـــژەی مردنیـــان گـــەلێ زۆرە کەچـــی زانـــا مادییـــە عەقیـــدە نەخۆشەکان سەرمڕای ئەو چەوساندنەوە سەختەی هەزاران بـە ڕای ئـەوان مردنیشیان قازانجە..

بەڵام ئەو زانا دڕندە مەرگ دۆستانەی کە خاڵی بوون لە هەموو سۆز و ویژدانێکی مرۆڤایەتی و گاڵتەجاڕییان بە مافەکانی مـرۆڤ دەکـرد و کەڵبـە و نینۆکیان زۆر درێژتر بوو لە هی پڵنگ و وورچە دڕندەکان هـەر بـەوە نەوەستان بەڵکو تیشکی دڕندایـەتی ئـەوان لـە ژێـر نـاوی (تـیرۆر) گەیشتە ناو کۆمەڵگا موسوڵمانەکان و پەیامە سەرسەختەکەی خۆیان گەیانـدە ئـەو ناوچـانەو بـەرگی ئیرهابیـان لەبـەر ئـاییـنی ئیسـلام کـرد و بەرگەکـەی ئیسلامیش کە بەزەیی و ئاشتییە لەبـەر خۆیانیـان هەڵکێشا بـەڵام لێیـان نایەت. ئەو تیرۆریستانە پێیان باش بوو کە مرۆڤە بـێ هێزەکـان بکوژرێن بۆ کەم کردنەوەو ڕێکخستنی ژمارەی دانیشتوان بەڵام لە پێنـاو ڕابواردن و هەوەسی جنسی هەرگیز پێیان باش نەبوو کە سێکسی ئازاد و جووتبـوونی ناشـەرعی قەدەغـە بکـەن تـاوەکو کۆمەڵگاکـەیان نەبێتـە نموونـەی شـارە مێرووێکی پڕ منداڵی زۆڵ و بێ باوك...

* هـەر لـە سـەدەی نـۆزدەدا زانـای بـایۆلۆجی فەرەنسـی (لامـارك) بزووتنـەوەیـەکی تـری فکری هاویشتە نێـو مەیـدانی هزرسازی ئـەورووپی، ئـەم زانایـە بـیرو ڕاکـانی لـەبارەی گـۆڕان و پەرمسـەندنی گیانـداران لـە جۆرێکـەوە بـۆ جـۆرێکی تـر زۆر بـە ڕاشـکاوانە مـژدەی دەرکـەوتنی بیردۆزێکـی لـەم جـۆرەی دەدا لـەم سـەدەیەدا. (لامـارك و بۆفـۆن و ئـەراسمۆس) ئـەو سێکوچـکە زانـا هاوچـەرخانە بـوون کـە بناغەیـەکی سەرەتاییان بۆ تیۆری پەرمسەندن داڕشت و باوەڕیـان وابـوو کـە ژیـان لـە

سەرەتادا لە ماددەی نازیندوو دروست بووەو زیندەوەرێکی سادەو ساکارو بێ هیچ ئەندامێکی لەش پەیدا بووەو دواتر بە کاریگەری ژینگەو سروشت گەشەی کردووەو گۆڕاوە بۆ گیانداری ترو ئەم گۆڕانە هەر بەردەوام بووە تاوەکو ملیۆنەها ئاژەڵ و گیاندار لە یەکتریەوە دروست بوون و لەکۆتاییشدا مرۆڤ ومەیموون لە یەك سەرچاوەوە دروست بوون و پەرەیان سەندووە.

گومان لەوەدا نییە کە هەر شێوانێك لە ڕیز بوونی گەردەکانی (دی ئێن ئەی) ڕووبدات دەبێتە هۆی شێوانی جەستەیی گیاندارەکەو پاشان مردنی، ئەم حاڵەتەش کە شێوانی ڕیز بەندی گەردەکانی (دی ئێن ئەی) ڕوو دەدات پێی دەووترێ (بازدان-الطفرة)، لامارك دەیووت بازدان دەبێتە هۆی پەیدا کردنی سیفەتی نوێ و دروست بوونی جۆری نوێی گیاندار بەڵام زانستی نوێ دەریخستووە کە بازدان بە مردنی گیاندارەکە کۆتایی دێت نەك ببێتە هۆی گۆڕانی گیاندارەکە بۆ گیانداری تر. هەروەها لامارك ڕای وابوو کە ژینگە کار لە ئەندامەکانی لەش دەکات و شێوەکەی دەگۆڕێ، بۆ نموونە دەیووت مراوی لەبەر ئەوەی بە بەردەوامی لەناو ئاو ژیاوەو مەلەی کردووە بۆیە پەنجەکانی پێی وا نووساون بەیەکەوەو بەم جۆرە هەڵکەوتووە تاوەکو مەلەی بۆ ئاسان بێت. بەڵام بۆچی ئەو مراوییانەی کە لە ووشکانیدا دەژین و هەر لە دێر زەمانەوە نەگەیشتوونەتە دەریا ئەوانیش پەنجەی پێیان بەیەکەوە نووساوەو هیچ جیاوازییان نییە لەگەڵ مراوییانی نێو دەریا لە کاتێکدا ئەوان هەرگیز لەناو ئاودا نەژیاون؟ ئەمە پرسیارێکە ئەگەر منیش نەمکردبایە بێگومان خوێنەری هۆشیار بە مێشکی دادەهات لەکاتی خوێندنەوەی ئەمەی سەرەوە...

بـەم جـۆرە یـەك بـەدوای یـەك داهـاتنی ئـەفكارە فەلسـەفییەكان لـە ئەوروپاو بەتایبەتی لەسەدەی نـۆزدەدا نەپچـڕایەوەو هـەر بـەردەوام بـوو. نـەمانی هەیبـەت و كاریگـەری پیاوانی ئـایینی گـەورەترین هۆكـار بـوو بـۆ ئەوەی هەر كەسێك بێت و لەلایـەن خۆیـەوە شـتێك دابهێنێت و تیۆرێـك دابڕێژێت. هەروەها قبول كردنی ئەو ئـەفكارو ئایدیایانـە لەلایـەن خەڵكـە ڕۆشنبیرەكەی ئەوروپاوە پاڵنەرێكی سەرەكی بوو بۆ بەدوای یـەك داهـاتنی تیۆرو بـیرو ڕای جـۆراو جـۆر. تەنانـەت لـەدوای سـەرهەڵدانی بـیرو ڕاكـانی بیردۆزی پەرەسەندن پاپای فاتیكان زۆر بەڕاشكاوی پاڵپشتی خـۆی بـۆ ئـەم بیردۆزە دەربڕی، ئەمە ئەوپەڕی چـۆك دادانـی پیـاوانی ئایینیـە بەرامبـەر داهێنـــەرانی فەلســـەفەو ئایـــدیاكان ئـــیتر ئـــەم قارەیـــە چـــۆن نابێتـــە جەستەیەكی گڕگرتوو بە كڵپەی ئایدیاو فكرە هەمەجۆرەكان..

** سەدەها سـاڵ پـێش زایـین ئەرسـتۆ ڕای وابـوو كـە ژیـان زۆر سـادەو ساكارەو سەرەتایەكی سادەشی هەیەو هەر بە ڕێكەوت دروست بووە. ئەمـە هەسـتیارترین فكـرەی فەلسـەفی بـوو كـە لـە سـەدەی نـۆزدەدا بـەڕەسمی زیندوو كرایـەوەو لـەنێو قـالبی بیردۆزێكـی زانسـتیدا جێگـەی بـۆ كرایـەوە لەلایەن زانای سروشتناسی ئینگلیزی (شارلس داروین)...

پرسـیارێكی هەسـتیارو ناسـك لەمێـژ بـوو لـە هەسـت و بـیری مرۆڤـدا دەخولایەوە كە هەردەم پرسیاری دەكردو دەیووت (ئایا ژیان چۆن دروسـت بـووە؟)، داروێـن لـە پێنـاو دۆزینـەوەی وەڵـامی ئـەو پرسـیارە بـیردۆزی پەرەســەندنی دارشـت كـە دەیـووت لەسـەرەتادا بـە ڕێكـەوت (الصـدفة) زیندەوەرێكی سادەو سەرەتایی لە تەنۆچكەیەك یان خانەیەكی نازیندووی ژێر خاكدا بە كاریگەری ژینگە دروست بووەو پاشان ئـەم زینـدەوەرە بـەرە

بەرە پەرەی سەندووەو گۆڕاوە بۆ گیانـداری تـر تـاوەکو هـەزارەها جۆری گیانـدار لـە یەکتریـیـەوە دروسـت بـوون و دواتـر لـە دوا قۆناغـدا ئاژەڵێـك دروست بـوو کـە لـەڕووی عـەقڵ و زیرەکییـەوە تۆزێـك پێشکەوتوو بـوو، هەروەها لـەڕووی شـێوازی هەڵکەوتنی ئەندامـە جەستەییەکانەوە زۆر لـە مەیموون نزیك بوو، پاشان ئەم گیاندارە پەرەی سەندوو دوو لقـی لـێ جیـا بوویـەوە کـە لقێکیـان بوونـە سەرچاوەی دروسـت بـوونی مەیموونـەکان و ئەویتریش بەرەو پێشەوە پەرەی سەندو گۆڕا بـۆ مـرۆڤ کـە لێـرەدا یەکـەم خاڵی ژیانی مرۆڤایەتی دەستی پێکرد!

کەواتـە چـۆلەکەو مشـك و کیسـەڵ و بـزن و بـەرازو مـەیموون بـاپیرە گەورانی مرۆڤن لە نەزەری داروین!، بـەم بـیردۆزە تـەم و مژاوییـە داروین ویستی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە کە دەیووت ژیان چۆن دروست بـووە؟، بـەڵام لەگـەڵ ئـەوەی کـە ئـەم بـیرو ڕایـە پرسـیارەکە نابڕێنێتـەوە بـەڵکو مرۆڤایــەتی ڕوو بــە ڕووی پرســیارێکی زۆر دژوارتــر دەکاتــەوە ئــەویش ئەوەیە کە (ئایا مرۆڤ لـە داهاتوودا دەگۆڕێـت بـۆ چ گیانـدارێك؟)، چونکە ئەگـەر ڕاسـت بێـت کـە مـرۆڤ بـەهۆی پەرەسـەندن و گـۆڕانی جەسـتەی گیانـدارانی پـێش خۆیـەوە دروسـت بـووە ئـەوا بێگومـان دەبێـت چاوەڕێی ئـەوە بکـات کـە لەسـەردەمێکدا جەسـتەکەی ئـەویش بـە پەرەسـەندندا تێدەپـەڕێت و دەگۆڕێـت بـۆ کـائینێکی تـر، بـەڵام ئایـا دەگۆڕێتـەوە بـۆ مـەیموون و کەنغـەرو سمـۆرەو دەچـێتەوە نێـو دارسـتان وەك سـەرەتاکەی یاخود بەرەو پێشەوە پەرە دەسەنێت و دەبێتە بوونـەوەرێك کـە ئەسـتێرە قوت بدات؟!. ئەسڵەن ئەمە گاڵتەجاڕی و یـاری کردنـە بـە نـرخ و قیمـەتی مرۆڤایەتی..

داروین دەڵێت: (ئەگەر مرۆڤ دان بەوە دابنێت کە گۆڕانکاری جەستەیی لە گیانداران و بوونەوەردا ڕوو دەدەن، ئەوا مرۆڤ هەردەم دەبێت چاوەڕوانی ئەوە بێت کە جەستەکەی خۆیشی بکەوێتە ناو زنجیرە گۆڕانێکی بەردەوام!).




لە سەدە کۆنەکاندا بیروڕا خورافیەکانی پەیوەست بە دروست بوونی ژیان دەیانووت گۆی زەوی لەسەر پشتی چوار فیل دانراوە، ئەم چوار فیلەش لەسەر پشتی کیسەڵێکی زۆر گەورە دان، ئەم کیسەڵەش لەسەر پشتی مارێکی گەورەدایەو ئەو مارەش لە سەر دەریایەکی بێ کۆتایی دایە!، ئەگەر زانا لایەنگرەکانی بیردۆزی پەرەسەندن لە سەردەمی عەولەمەدا ئەم ڕایانە ببیستن بە خورافەو دواکەوتوویی عەقلی لەقەلەمی دەدەن، بەڵام بیردۆزێکی وەکو پەرەسەندن کە داروین خاوەنەکەیەتی، خورافەیەکی وا باس دەکات لەبارەی گیانداری سەدەف (صدف المحار) بەجۆرێك کە چیرۆکی چوار فیلەکە زۆر پێشکەوتووترە لە ناحیەی فیکرییەوە!، گیانداری سەدەف لەکاتی

جوولەیــدا جەســتەی دەكرێتــەوە بــەهۆی جومگەیــەك كــە هــەر لــە جومگەكەی دەرگا دەچێت، هەمووما ئەو جومگەیەی دەرگامـان دیـوە كـە دەرگـا بەهۆیـەوە بـە چوارچێوەكەوە دەبەسـترێ و لەسـەر ئـەم جومگەیـە دەرگاكە دەكرێتەوەو دادەخرێت. گیانداری سەدەف جەسـتەی دەكرێتـەوەو دادەخرێت بەهۆی جومگەیەكی هاوشێوەی جومگـەی دەرگـا، جـا بـابزانین داروین چی دەڵێت لە بارەی ئەم جومگەیە..

داروین دەڵێت: (جومگەی دەرگا پێویستی بە كەسێكە تـاوەكو دروسـتی بكات بەڵام جومگەی سەدەف پێویستی بە هـیچ كەسێك نییـە بـۆ دروسـت بوونی، بەڵكو هەر لەخۆیەوە بەڕێكەوت دروست بووە!)..

ڕەنگـە زۆربــەمان بەسـەرهات و داسـتانە كۆنـەكانمان خوێندبێتـەوە، داسـتانە كۆنـەكانی وەكـو ئۆدیسـا و گلگـامێش و چـەندانی تـر، دەبیـنین هـەموویان خواوەنـدێكیان تیـا بـاس كـراوەو پەرستشـی بـۆ كـراوە، داسـتان بەبێ خواوەند نابێت چونكە ڕووداوەكانی دوورە لە ڕاسـتی و بـەم هۆیـەوە داسـتانەكە پـیرۆز دەكـرێ. بێگومـان بیردۆزەكـەی داروینـیش داسـتانی گیاندارانـەو داروپـن خواوەنـدێكی بـۆ داسـتانەكەی دروسـت كـردووە كـە ئەویش بریتییە لە ڕێكەوت (الصدفة). لە دیدەنگای داروینیزم دا هەرچی هەیـە لـە گـەردوون و گیانـداران و ڕووەك و مـرۆڤ بـە ڕێكـەوت دروسـت بوون. بەر لە هەموو شتێك با ئەوە بزانین كە ڕێكەوت هێـز نییـە تـاوەكو كـار لـە شـتەكان بكـات و شـت دروسـت بكـات بـەڵكو ڕێكـەوت هـەر خـۆی پێویسـتی بـە هێزێـك هەیـە تـاوەكو ڕێـك بكـەوێت.. بـا نموونەیــەك وەربگرین....

ئەگەر گشت پێکهاتە ئەندامییەکانی لەشی گیاندارێك وەربگرین، وەکو خوێن و ئاوو پرۆتین و خانەکان و چەوری و لیمفەکان، ئینجا تێکەڵیان بکەین لەگەڵ تۆپەڵێك قوڕی ساف و خاوێن و بیکەینە تۆپەڵە قوڕێکی پڕ لە ماددەی گونجاو بۆ ژیان، پاشان لەو قوڕە پەیکەرێك لە شێوەی کەروێشك دروست بکەین و تەنانەت گشت کۆئەندامەکانی ناوەوەشی لە قوڕەکە بۆ دروست بکەین، پاشان ئەم پەیکەرە لەسەر لووتکەی شاخێك دابنێین و بیدەینە بەر دەستی هۆکارە ژینگەییەکان و دەرفەتی پێنج ملیۆن ساڵ بە ڕێکەوت بدەین، ئایا ئەم پەیکەرە بە ڕێکەوت ژیانی وەبەر دێت؟!، بێگومان مەحاڵەو ناکرێ. دەی خۆ ئەو پەیکەرە قوڕییە گشت مەرج و ماددە ئەندامییەکانی ژیانی تیایە بەڵام کوا ڕێکەوتەکەی داروین؟، ئەمە گەورەترین بەڵگەیە بۆ ئەوەی بزانین کە ژیان هەرگیز لە ماددەی نازیندوو لەخۆیەوە دروست نەبووە بەڵکو لە هەموو جۆرێك جووتێکی نێرو مێ دروستکراوە لەلایەن خالقێکی بێ هاوتا کە ویستی ئەو لەسەر ئەوە بووە ژیان لەم جووتەوە بەردەوام بێت..

ڕێکەوت ئەو هێزە خەیاڵییەیە کە داروینییەکان پەرستشێکی ڕاستەوخۆیان بۆ دەکرد بەڵام گومان لەوە دا نییە کە ڕێکەوت تەنها ووشەیەکی واتاییەو بوونی نییە. ئایا ڕێکەوت ئەو سۆزەی خستۆتە دڵی دایکان تاوەکو لەپێناو بەچکەکانیان بە گیانی خۆیان قوربانی بدەن؟ ئایا ڕێکەوت لە شەوە زەنگە تاریکەکان دا بە مانگی پڕشنگدار ئاسمان ڕووناك دەکاتەوە؟ ئایا ڕێکەوت ناهێڵێت گازو تیشکە ژەهراوییەکانی نێو بۆشایی ئاسمان تێکەڵ بەم ئۆکسجینە خاوێنەی سەر زەوی ببن؟ ئایا ڕێکەوت بە ئاوی ووتووە تۆ بێ تام و بێ بۆن و بێ ڕەنگ بە؟ ئایا ڕێکەوت سەرکوڵمەکانی منداڵی ساوا بە ڕەنگی سوور ڕەنگ دەکات؟ ئایا ڕێکەوت بە

قەلەمی قـەدەر زانیـاری نێـو کتێبێکـی چل هـەزار لاپـەڕەیی لەسـەر یـەك گەردی (دی ئێن ئەی) نووسـیوەتەوە؟ یـاخود ڕێکـەوت فـەرمانی فـەرمووە کـە فیـل و ئەسـپ و ووشـتر باڵیـان نـەبێت نـەوەك گشـت بـەرە بـەیانێك ماڵەکەی داروین بە سەر سەریدا کاول بکەن؟!.. * ئێستا با بێین هێلکە بـە نموونە وەربگرین، بێگومان هێلکە بریتییە لە خانەیەکی گەورە کە گشت پێکهاتەکانی خانەی تیایە وەکو پەردەو ناوك و شلەکان و تەنانـەت ترشـە ناوەکی و جیناتەکانیش، هەروەها هێلکـە پـیتراوی نێـوان نێـرەو مێیەشـەو گشت مەرجەکانی ژیانی تێـدا دەسـتەبەر دەبێـت. هێلکـە کاتێـك بـە شـێوە ئاسـاییەکەی خـۆی لـە ژێـر سـکی مریشـك دادەنـرێ، لـەکاتی هـەڵهێنان دا بەچـکەیەکی هۆشـیارو کامـل و بـێ عـەیب دروسـت دەبێـت کـە لـە ڕووی پێکهاتەی جەستەییەوە زۆر بەهێزەو لەوپەڕی توانـاو هێـزی مانەوەیـە لـە ژیان دا، بەڵام کاتێك هەمان هێلکە بە شێوەیەکی میکانیکی دەخرێتـە نێـو ئـامێری هـەڵهێنان لـە کارگـەکان دا دەبیـنین کـە بەچکەی ناتـەواوو لاوازو نەخۆش دروست دەبێت کە بـێ هێـزەو توانـای مانـەوەی بـۆ کـاتێکی کـەم هەیە لە ژیان داو دواتـر دەمـرێ، ئێسـتا لێـرەدا پرسـیارێك دێتـە پێشـەوە، ئێمە دەبینین لـە کارگـەکانی هـەڵهێنان داو لـە نێـو ئـامێری تـرووکانـدن دا هەمان ژینگەی ژێر سکی دایك دەڕەخسێنرێ و چـەندین پلانـی زانسـتی و مەرجی پزیشکی تێدا دەستەبەر دەکرێ و چەنـدین ئـامێرو کرێکـار تیایـدا کار دەکەن ئینجا ناتوانن بەچکەیەکی سـاغ و بـێ عـەیب پـێ بگەیـەنن کـە توانای جەستەیی بەرز بێت و بتوانێت بە پشت بەستان بەخۆیەوە بـژیت، باشـە ئـەو هـەموو مانـدوو بـوون و تێچـوونەی کارگـەکان ئەنجامەکـەی وەچـەیەکی ناتـەواوو لاواز بێـت ئـەی( ڕێکـەوت)ی سـادەو سـاکار کـە هـەر بوونیشی نییە دەبێت توانـای چـی هـەبێت؟!. خـۆ ڕێکـەوت هـەر خەیاڵەو

بەچاویش نـابینرێ و هـیچ جوولـەو کارێـك ناکات ئـیتر شـتێك کـە هـەر بوونیشی نەبێت و تەنها خەیاڵ و ئەفسانە بێت چۆن دەگـرێ ئـەو هـەموو زینـدەوەرو گیانـەوەرو مرۆڤـەی سـەر زەوی دروسـت بکـات کـە لەوپـەڕی هێـزی جەسـتەیی و توانـای مانـەوەن لـە ژیـان دا؟... ئەگـەر ئـەو هـەموو مانـدوو بوونـەی کارگەیـەکی زانسـتی نـەتوانێت ژیـانێکی بـەردەوام بـەم پەلەوەرانە بدات بێگومـان ڕێکەوت ناتوانێـت ناوێکیشیان لـێ بنێـت نـەك دروسـتیان بکـات. زانـای بـەناوبانگی بیرکـاری (فریـد هویـل) لـەبارەی دروستبوونی یەك خانە بە ڕێکەوت دەڵێت (نموونەی دروست بوونی خانە لەخۆیـەوە بـە ڕێکـەوت، وەك ئـەو نموونـە وایـە کـە بایـەکی بـەهێز هەڵبکوتێتە سەر کۆمەڵێك پارچە ئاسن و بە ڕێکەوت فڕۆکەی (بـوینگ ٧٤٧) لەم پارچە ئاسنانە دروست بێت لە خۆیەوە!)....

# بەشی دووەم

## مێژووی فکرەی پەرەسەندن و قۆناغەکانی

سەیرترین و سەر سوڕهێنەرترین کائن و بوونەوەر لە گشت قۆناغەکانی مێژووی ژیاندا، ئەو مرۆڤەیە کە هەر لە سەرەتای دروست بوونییەوە جیهانێك بووە لە نهێنی و سەیرو سەمەرەی هەمەجۆر، عەقل و زیرەکی تاکە هێڵی سووری جیاکردنەوەی مرۆڤە لە ئاژەڵ و بوونەوەرانی تر. مرۆڤ بە عەقلێکی گەورەو پلەیەکی بەرزی زیرەکی هاتۆتە سەر ئەم زەوییەو شتی سەیرو سەمەرەی ئەنجام داوە و داهێنانی گەورەی لە گشت بوارەکاندا کردووە کە لە توانای هیچ چینێکی ئاژەڵاندا نییە کاری وا بکات تەنانەت خێزانی مەیموونە زیرەکەکانی وەکو ئۆرانج و غورێللاو شەمبازی. مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە عەقل و هۆشی بزواوە بەرامبەر خۆی و ژینگەی دەوروبەری و ئەو سەر زەوییەی تێیدا دەژی و ئەو ئاژەڵ و ڕووەکانەی کە لەگەڵیدا بە هاوبەشی دەژین لەسەر ڕووی ئەم زەوییەدا. ڕاکردن و هاتووچۆکردنی ئاژەڵان و فڕینی باڵداران بە ئاسمانەوە و گەشە کردن و ڕووانی ڕووەکە هەمە چەشنەکان و هەڵکردنی باو دابەزینی باران و بەیەکدادانی شەپۆڵەکانی ئاوی دەریا و گرمەی هەورەتریشقەو بریسکەی بروسك و بەرزایی لووتکەی شاخەکان و بەدوای یەك داهاتنی شەوو ڕۆژو چەسپاوی و ڕاوەستانی ئەستێرەو خۆرو

هەسارەکان بەبێ هیچ کۆڵەگەیەك، هەروەها غەریزە و ڕەفتار و شێوازە سەیرەکانی ژیانی ئاژەڵان و لەیەك چوونی گیانداران لەڕووی جەستەو ڕەفتارەوەو سەرەڕای هەموو ئەمانەش گەورەیی و سەرکردەیی و سوڵتانی مرۆڤ لەسەر زەویداو چەندین دیمەن و دیاردەی تری سەیرو جوانی سەر زەوی کە هەر لەباس کردن نایەت، ببوونە جێگەی سەرسوڕمان و تێڕامانی مرۆڤ.

ئەم جیهانە سەیرو سەمەرەو ڕێك وپێك نەخشاوە هەر لە سەرەتاوە وای لە مرۆڤ کرد کە بیر لە سەرەتاو چۆنیەتی پەیدابوون و دروست بوونی خۆی و گەردوون و گۆی زەوی و گیانداران بکاتەوە. ئەوە مرۆڤە کە بوونەوەرێکی ئەوەندە سەیرە وا عەقلی خۆی خستۆتە گەڕ بۆ زانینی زانیاری سەبارەت بە جیهانی پێش هەبوونی خۆی کە خۆی هەرگیز لەوێدا نەبووە!.

ئارێشەی سەرەتای دەرکەوتنی ژیان لەسەر زەویدا بابەتێك بووە کە بیرو هزری مرۆڤ هەردەم بە دەوریدا خولاوەتەوە و هەوڵی دۆزینەوەی سەرەداوی ئەم بابەتەی داوە تاوەکو پەنجە لەسەر یەکەم خاڵی دەست پێکردنی ژیان دابنێت و مێژوویێك بۆ سەرەتای خۆی و دروستکراوانی تر لەسەر کاغەزی فەلسەفەدا بنووسێتەوە. بەپێی تێپەڕ بوونی کات مرۆڤ ئەم بابەتەی چڕتر کردۆتەوەو زیاتر بۆتە تەوەرەی بیرکردنەوەکانی مرۆڤ. ئاژەڵان لە ئاستی ئەو زیرەکییەدا نەبوون تاوەکو بیر لە سەرەتای ژیانیان بکەنەوەو هەر ئەوەندەی لە عەقل پێدراوە کە دەم بخاتە سەر تۆپەڵە گیایەك و مژدەی تێربوون بە سکە برسییەکەی بدات. بەڵام خۆ کێشەیەك لە ئارادا نییە چونکە مرۆڤ ئەو کارەی بۆ ئەوانیش دەکردو بە

دوای زانینی سەرەتاکەی ئەوانیشەوە وێڵ بوو. بەم جۆرە ئەم بیرکردنەوەو لێکدانەوانە سەرتاپای بیرو هزری مرۆڤی داگرت و بابەتەکە بووە کێشەیەك کە ئادەمیزاد خۆی بە پلە پلە یەك لە بازنەی ئەم کێشەیەدا دۆزییەوە. هەر لەمەوە بیروباوەڕی سەیرو نامۆ و خوراق سەریان هەڵدا کە لێکدانەوەیەکی هەڵەو دوور لە ڕاستیان بۆ گەردوون و دروستکراوەکان دەکرد. بۆ نموونە سەرهەڵدانی بیروڕای هەمە چەشنی وەکو ئەوەی کە دەیانووت زەوی لەسەر پشتی ماسی یان فیل یان ئەژدیها دانراوە! یاخود دەیانووت پەلکە زێڕینە بریتیە لەشمشێری خواوەندەکان بۆ لێدانی خراپەکارو تاوانباران!

ئا لەم کاتە کۆنانەو لەم سەردەمە دێرینانەدا، (ئایینەکان) بەهێزترین فاکتەری شی کەرەوە و ڕێ نیشاندەر بوون بۆ مرۆڤ کە سەرەتاو چۆنیەتی دروست بوون و پەیدابوونی گەردوون و گیانداران و ڕووەك و ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیان هەمووی بە دروستکراوی خوا لە قەلەم درا. ئەمە بیرێکی زۆر سادەو ساف و پەسند بوو تاوەکو مرۆڤ لەو کاتەدا لەم جۆرە بیرکردنەوانە بوەستێ و ڕاستی دەستکەوێ. ئایین ئەو هەموو نەخشەسازی و جوانکارییەی ژیان و دروستکراوەکانی گێڕایەوە بۆ توانا و لێزانی خودایەك کە ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾...

بە سەرنجمان لە مێژووی ئایینەکاندا دەبینین بە درێژایی مێژوو، دوو جۆرە ئایین دەرکەوتوون کە بریتین لە ئایینە ئاسمانیەکان و ئایینە دەستکردەکان، ئایینی ئاسمانی تەنها خوا بە دروستکارو خاوەن و خالقی بوونەوەران دەزانێت و هەر ئەو خوایەشە کە هۆکارەکانی ژیان دەڕەخسێنێ. لە پێناو گەیاندنی پەیامی ئایینە ئاسمانیەکان خودا چەند

مرۆڤێکـی وەکـو پەیامبــەر دەســت نیشـان کـردووە تـاوەکو پــەیامی ئــەو هەڵبگرن و گـەلان ڕزگـار بکـەن لـە پەرسـتش کـردن بـۆ پەیکـەرو سـوڵتانە زۆردارەکان. ئێستا لە سەردەمی ئێمەدا سێ ئایینی سەرەکی ئاسمانی مـاون و بوونەتـە سەرچـاوەی بیروڕاکـانی خـەڵك، ئـەو ئایینانــەش بـریتین لـە (یەهودیـەت و مەسـیحیەت و ئیسـلام) و هـەروەها ئـایینی (صـابئة) بـە ئایینێکی ئاسمانی دادەنرێ بەڵام ئەمڕۆ کزبووە و پـەیڕەوانێکی کـەمی لـێ ماوەتەوە. لە قۆناغە جیا جیـاو کۆنـەکانی مێـژووی ئایینـە ئاسمائیەکانـدا زیـاتر نــاوی شــەش پیــاوی پەیامبــەر دەبیســتین کــە هــاتوون ئــایینی ئاسمانییان بـۆ خـەڵك هێنـاوە و بـە چـەکی ئـەو پرسـیارە هەسـتیارەی کـە دەڵێت ﴿أَفِي ٱللَّهِ شَكّٞ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ ئیعلانی شەڕێکی فکرییـان کردووە لەگەڵ مرۆڤەکان و ڕێـڕەوی ئـەفکارو فەلسەفە مرۆڤایەتیـەکانیان هەڵسووڕاندووە بەرەو لایەکی تر. ئەم شەش پیاوەش بە ڕوونـی لـە کتێبـە پیرۆزەکـانی ئـەم ئایینانــەدا باسـکراون کـە بـریتین لـە (ئـادەم - نــوح - ئیبراهیم - موسا - عیسا - محمد )...

بەڵام ئایینە دەستکردەکان بەپێی بیروڕاو بۆچوونەکانی مـرۆڤ سـەریان هەڵداوەو لە هەندێك لـەم ئایینانـەدا ئەسڵەن هـەر ئـیعتراف بـە هـەبوونی خودا ناگرێ و سـەرەتای دروسـتبوونی ژیـان بـەپێی بۆچوونەکانی خۆیـان لێکدەدەنــەوە. نموونــەی ئــەم جـۆرە ئایینانــە وەکـو ئــایینی (بـوذي) کــە ئــایینێکی کۆنــەو لــە فەلسـەفەی هیندۆسـیەت جیـا بۆتــەوە. بــەپێی ئــەم ئایینە مرۆڤەکان دەتوانن بە ئاسوودەیی و بەختەوەری بژین بەبێ ئەوەی پێویستیان بە خودا بێت!

تاکە هۆکاری پەیدا بوونی ئەو ئایینە دەستکردانە ئەوە بوو کە خەڵکی ئەوکاتە بیروڕایان نەدەگونجا لەگەڵ ئایینە ئاسمانیەکان چونکە عەقڵێکی ئەوەندە سادەو ساکارو ئاستێکی ئەوەندە نزمی زانیارییان هەبوو داوای بینینی ئەو خودایەیان دەکرد کە پەیامبەران بانگخوازی بوون و فەلسەفەی ﴿أرنا الله جهرة﴾ هەر لە سەرەتای مرۆڤایەتییەوە وەکو چەکێك وابووە لە دژی ئایین و ئایین خوازان ...

جا بۆیە مرۆڤ وورده وورده هاتە قۆناغی ترو بیری لە شتی سەیرتر دەکردەوە، مرۆڤ تا دەهات شتی زیاتری لە دەوروبەری خۆی دەبینی کە بەرەو بیرکردنەوەی هەمەجۆر ڕایان دەکێشا تاوەکو گەیشتە سەردەمێك کە تیایدا عەقل و هۆشی مرۆڤ جۆرێك لە هۆشمەندی پێوە دیاربوو بە تایبەتی لە سەردەمی (دەرکەوتنی فەلسەفەی یۆنانییەکان).

مرۆڤ لەو سەردەمانەدا فکرێکی زۆر سەیری بە مێشك داهات لەبارەی سروشت و ژیان. ئەویش فکرەی گۆڕان و گەشەکردنی گیانداران بوو لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر. مرۆڤ کاتێك سەیری گیاندارانی دەکرد دەیبینی کە لەنێوان جۆرەکاندا پەیوەندی و لێك چوونێکی بە هێز هەیە بۆیە وای دانا کە کاریگەری ژینگە و سروشت گیاندارێك دەگۆڕێ بۆ گیاندارێکی ترو مرۆڤیش لە ئەنجامی زنجیرەیەك گۆڕان و پەرەسەندنی گیاندارانی پێش خۆیەوە دروست بووە. لێرەدا هەست دەکەین کە فکرەی گۆڕان و پەرەسەندن شتێکی نوێ نییەو داهێنراوی تاکە کەسێك نییە. بەڵکو مێژوویەکی دوورو درێژی هەیەو عەقل و بیری کۆمەڵگای مرۆڤایەتی کۆن دایهێناوە. فەیلەسوفە یۆنانیەکان بە یەکەم کەسانێك دادەنرێن کە زۆر بە ڕوونی بیروڕایان بە لای ئەم بابەتەدا شکاوەتەوە و

باسیان لە شتێکی لەم جۆرە کردووە. یۆنانیەکان بە دیـدێکی فەلسەفییانە سەیری ڕاستیەکانی بوونەوەرو ژیانیان کردووە کە جۆرێك لە حیکمـەت و ژیری تیا بەدی دەکرێ. بـەڵام فەلسەفەی یۆنـانی لـەم بـوارەدا زۆر لاوازەو نووسراوی کـەمیان لێ ماوەتـەوە بـەهۆی لـەناو چوونی زۆرێـك لـە بنـەما فەلسـەفییەکانیان.. ئەگـەر گەشـتێك بـەناو فەلسـەفەی یۆنانـدا بکـەین دەبیـنین کـە بـە شـێوەیەکی وا زانسـتیانە جـەختیان لەسـەر گـۆڕان و پەرەسـەندنی گیانـداران کردۆتـەوە بـە جۆرێـك کـە جیاوازییـەکی ئـەوتۆ نـابینین لـە نێـوان بیروڕاکـانی ئـەوان و بەڵگـە زانسـتیەکانی ئێسـتای بانگخوازانی پەرەسەندن.

فەیلەسووفی نـاوداری یۆنـانی (ئەرسـتۆ) چـەند سـەدەیەك پـێش زایـین هەڵسا بـە تـەواو کردنـی ڕێبـازە فەلسـەفییەکەی (ئـەفلاتۆن) و لەسـەر بنـەمای بیروباوەڕەکـانی ئـەو، فەلسـەفەکەی خـۆی داڕشـت و ئەرسـتۆ ڕای وابـوو کـە ژیـان سـادە و سـاکارەو سـەرەتایەکی سادەشـی هەیـەو هـەر لەخۆیـەوە دروسـت بـووە. لـە کـاتی لێکۆڵینـەوە لـە قۆناغـەکانی مێـژووی فکـرەی پەرەسـەندن دەردەکـەوێ کـە ئەرسـتۆ بـە داهێنـەرو بنیاتنـەری یەکەمی تیۆری پەرەسەندن دادەنرێ و یەکەم کەس بوو کە فکـرەی گـۆڕان و پەرەسەندنی تێکەڵ کرد بە ئەفکارەکانی مرۆڤ.

هەروەها (ئەنکسمەندەر) کە فەیلەسووفێکی یۆنانییـەو لـە دەوروبـەری سـاڵی (٦١٠) ی پـێش زاییـنـدا ژیـاوە بیروڕاکـانی لـەم بارەیـەوە زۆر ڕوون و ئاشکرایە هەروەك لەم قسەیەیدا کە دەتـوانین بڵێین سـەرجەم بیروڕاکـانی پەرەسەندنی تێدا کۆکردۆتەوە کە دەڵێت :-

**(گەشـەکردن و پەیـدا بـوونی گیانـداره زینـدووەکان سـەرەتا بـه هـۆی کاریگەری تیشکی خۆرەوە بووە، کاتێك کە گۆی زەوی پێکهاتەیەکی فورِی شێدارتر بووە لە ئێستا تیشکی خۆر لێیداوە و توخمە شـێدارەکانی نـاوی گەرم داهـاتووە و هاتۆتـه دەرەوەو لەسـەر ڕووی زەوی جێگیر بـووە. لـەم توخمانەوە یەکەم گیانـدار دروست بوو بەڵام گیانداریکی چرو نارێك بـوو کە بە بەرگێکی زبر داپۆشرابووکە توانای جووڵە و زاوزێ و خۆپاراستنی نــەبوو، بـــەڵام لەگـــەڵ زیـــادبوونی کـــاری تیشـــکی خـــۆرو کارتیاکـــەرە ژینگەییـەکان گیانـداری تـر دروسـت بـوو کـە توانـای جوولـەو زاوزێیـان هەبوو. بەم جۆرە مرۆڤ لە دوای هەموو گیاندارەکانی تر دروست بوو. لە سـەرەتادا مـرۆڤیش پێکهاتـەو جەسـتەیەکی نـارێکی هـەبوو بـەڵام ووردە ووردە گۆڕا تاوەکو کەوتە سەر شێوەی ئەو مرۆڤەی کە ئەمرۆ دەیبینین).**

لەم بیرورِایەی پێشوودا ئەوەمان بۆ دەردەکـەوێ کـه فەلسـەفەی یۆنـانی لـەم بابەتـەدا جـەخت لەسـەر دووشـت دەکاتـەوە, یەکـەمیان ئەوەیـە کـە تیشکی خۆرو خاك دەکاتە سەرچاوەو هۆکاری دروسـت بـوونی ژیـان نـەك رێکەوت (الصدفة). دووەمیان ئەوەیە کە مرۆڤ و گیانـدارانی تـر تەسـلیمی چەنـدین گۆڕانکاری و پەرەسەندنی جەستەیی بوون تـاوەکو گەیشـتوونەتە ئەمرۆ ...

هـەروەها (لۆکریتیـۆس) لـە سـەردەمی شارسـتانیەتی یۆنانـدا زۆر بـە راشکاوی بیروباوەڕی ئایینە ئیغریقیـەکانی ڕەت دەکـردەوەو بـە خورافیـات وەسفی دەکردن . لۆکریتیۆس دەیووت:-

**(مرۆڤ دڕنـدەیەکی چۆڵەوانی بووەو بەهۆی شارستانیەتەوە بیرو هۆشی پەیدا کردووە, هەروەها مرۆڤ کانزای مس و ئاسنی دۆزیوەتـەوە و پاشـان**

**بەهۆی ژیانی کۆمەڵایەتی و شارستانیەوە زمانەکان دروست بوون بۆ قسەکردن).**

بەم جۆرە دەتوانین بڵێین فەلسەفەی یۆنانی یەکەم خشتی داناوەتە بناغەی بیردۆزی گۆڕان و پەرەسەندنی بوونەوەران. بەڵام با ئەوەش بزانین کە یۆنانیەکان لەم بوارەدا بە پێشەنگی سەرەکی دانانرێن بەڵکو لە گشت ناوچە جیا جیاکانی جیهان لێکۆڵینەوە و بیروباوەڕی لەم جۆرە سەریان هەڵدەداو زانایانی بواری ئەنترۆپۆلۆجیاو سروشتناسی لە هەوڵی دۆزینەوەی سەرەداوی ئەم بابەتەدا بوون. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مێژووی عەرەبی و فەرهەنگی فەیلەسووفانی عەرەب، دەبینین کە گروپێکی زانستی بەناوی (إخوان الصفا) لە سەدەی دەیەمدا یەکەم کەس بوون لە ناو عەرەبەکاندا کە بە شێوازێکی زانستی باسی گۆڕان و پەرەسەندنی گیانداران و ڕووەکیان دەکرد. تەنانەت هەوڵیان دەدا کە بیرو ڕای پەرەسەندن و ئایینی ئیسلام لە یەك نزیك بکەنەوە. ئەم گروپە بنکەیان لەشاری (بصرة) ی باشوری عێراق بوو کە بیروڕاو بنەما زانستیەکانی خۆیان لە گشت ناوچە عەرەبییەکاندا بڵاو دەکردەوەو بەڵگەکانی خۆیانیان لەسەر شێوەی نامەی زانستی تۆمار دەکرد. نووسراوەکانی ئەم گروپە بایەخێکی گەورەی پێ دەدرێ لە بوارە زانستیەکانداو تەنانەت ئەگەر زانا لایەنگرەکانی بیردۆزی پەرەسەندن ئەم نووسراوانە دیراسە بکەن ڕەنگە زۆرێك لە بیرو باوەڕەکانی ئەم گروپە وەربگرن و بیکەنە بەڵگە بۆ سەلماندنی تیۆرەکەیان. ئەم گروپە زانستیە عەرەبیە لە بواری پەرەسەندندا زۆر بابەتی سەیر باس دەکەن و هەندێك ووشەو دەربڕینی وایان بەکار هێناوە کە ڕێك لەگەڵ زاراوە زانستیەکانی ئێستای بیردۆزی

پەرمسـەندن یەکدەگرێتـەوە بـۆ نموونـە/ بۆمـاوە، هەڵبـژاردنی سروشـتی، بنەبڕبوون (الانقراض).

(إخوان الصفا) یەکەم کەسانێك بوون کە دەیانووت جیهانی گیانداران و ڕووەك و بێ گیانەکان یـەك سەرچاوە و یـەك شـت بـوون بـەڵام لـە یـەکتر جیـا بوونەتـەوە. فەلسـەفەی عـەرەبی لـە بـواری پەرمسـەندن دا زۆر بـە هێزتـربوو لە فەلسەفەی یۆنانی چونکە بیروڕاکانی زانـا یۆنانیـەکان تـەنها سـەرزارەکی بـوون و نەدەنووسـرانەوە بـەڵکو تـەنها بـە قسـەو گێڕانـەوە مایەوە تـاوەکو گەیشـتە سـەردەمێك کـە تیایـدا فەلسـەفە سـەرزارەکیەکانی یۆنانی خرانە سەر کاغەزو نووسرانەوە. بەڵام هی (إخوان الصفا) وا نەبوو بـەڵکو ئەنـدامانی ئـەم گروپـە هـەر خۆیـان بیروڕاکـانی خۆیـان لـە شـێوەی چەند نامەیەکی زانستی نووسییەوەو وەکو مەنهەج و بیردۆزێـك وابـوو بـۆ ئەو کاتە. جا بۆیە ئەم گروپە بە خـاوەنی یەکـەمی بـیردۆزی پەرمسـەندن دادەنرێن و دەتوانرێت بیروڕاکانیان وەکو یەکەم بیردۆزی زانسـتی بناسـرێ لەم بوارەدا.

لـە یـەکێك لـە ووتـەکانیان کـە دەربـارەی گۆڕان و گەشـەکردنی ڕووەك هـاتووە دەڵێـت (یەکـەم قۆنـاغی دەرکـەوتنی ڕووەك ئـەو جـۆرە ڕووەکـە ووردانە بـوو کـە سـەرەتا لەسـەر زەوی و بەردەکانـدا وەکـو تـۆزی ووردی سەوز دەردەکەوتن. پاشان باران لێیداو گۆڕا بۆ جۆرێکی تـری ڕووەك کـە جیـاواز بێـت لـە هـی پێشـوو. ئینجا کاتێـك تیشـکی ڕۆژ لێـی داوە، گـەرم داهاتووە و ووشك بۆتەوەو دووبـارە گـۆڕاوە بـۆ جـۆرێکی تـر. بـەم جـۆرە بەپێی کارتێکردنی ژینگە هەر لە گۆڕان بەردەوام بووە تاوەکو گەیشتۆتە دوا قۆناغ کە ئەویش داری خورمایە).

وەك دەبینین ئەم بیروڕایە بانگەشەی ئەوە دەكات كە لە سەردەمێكدا ڕووەك بوونی نەبووە بەڵام دواتر ڕووەكی ووردی سەوز لەسەر بەردو خاكدا دەركەوتوون هەروەها ڕایان وا بووە كە ڕووەكەكان هەردەم لە گۆڕان و پەرەسەندندان بەهۆی هۆكارە ژینگەییەكان. بێگومان ئەگەر پوختەی بیروڕاكانی لایەنگرانی پەرەسەندنی ئێستا شی بكەینەوە هیچ جیاوازییەك بەدی ناكەین لە نێوان بیروڕاكانی داروینیەت و ووتەكانی ئەم گروپە عەرەبییە. هەروەها لە بەشی دووەمی ووتەكە لە بارەی دارخورماوە دەڵێن:-

**(داری خورما قۆناغی كۆتایی ڕووەكەكانە، كە لە دوای ئەوەوە ژیانی ئاژەڵان دەستی پێكرد. ئەم دارە" ڕووەكێكی ئاژەڵانییە" چونكە زۆر لە كردارەكانی جیاوازە لەگەڵ ڕووەكەكانی تر هەر چەندە بەجەستە وەكو ڕووەك سەیری دەكرێ).**

پۆلێك ڕووناكبیری عەرەبی لەبەر ئەوەی لە شاری بەسرە ژیاون و ناوچەكەیان زۆر بەچڕی داری خورمای تێدا ڕوواوە بۆیە هەردەم جەخت لەسەر ڕووەكی دارخورما دەكەنەوەو تەنانەت سەرەتای دەركەوتنی ئاژەڵان بۆ گۆڕانی دارخورما دەگەڕێننەوە. لە ووتەكەدا دیارە كە دەڵێن دارخورما زۆرێك لە سیفاتەكانی ئاژەڵانی تیا بەدی دەكرێ بەڵام هیچ سیفەتێكی هاوبەشی نێوان ئاژەڵ و دارخورما باس ناكەن. هەروەها دارخورما ڕەگێكی زۆر توندی داكوتیوەتە قوڵایی زەوی كە ئەگەر ئەم دارە لە زەوی جیا بكرێتەوە یەكسەر دەمرێت بەڵام لە هەموو جیهاندا تەنانەت بچوكترین گیانداریش بەدی ناكرێت كە یەك سەنتیمەتر لە ئەندامێكی لاشەی

بەزەوییەوە بەند بێت. لەدرێژەی باسەکانی (إخوان الصفا) دا شتێکی تر لەم بابەتەدا باس دەکرێ کە دەڵێن:-

**(جۆرێکی تری ڕووەك هەیە (اکشوث)، کە بە جەستە ڕووەکە بەڵام کارو ڕەفتارەکانی لە گیانداران دەچێت. ئەم ڕووەکە ڕەگێکی جێگیری نییە وەکو ڕووەکەکانی تر، هەروەها گەڵاکانیشی لە ڕووەکەکانی تر جیاوازە. ئەم ڕووەکە خۆی بە دارو درەختەکانی تر هەڵدەواسێ و لە شێداری ئەوانەوە ئاوو خۆراك هەڵدەمژێت).**

لێرەدا دەیانەوێت ڕووەکێکی بێ ڕەگی وەکو (اکشوث) نزیك بکەنەوە لە جیهانی ئاژەڵان و بە ڕووەکێکی ئاژەڵانی وەسفی دەکەن بەڵام دواتر دەڵێن ئەم ڕووەکە خۆی هەڵدەواسێ بە ڕووەکەکانی تروخۆراکیان لێ هەڵدەمژێ، کەواتە هەر لەم قسەیەدا دیارە کە ئەم ڕووەکە ناتوانێت لە جیهانی ڕووەکان جیا بێتەوە چونکە ژیانی لەسەر ڕووەکەکانی تر بەندە. جا بەپێی گشت لقەکانی زانستی پۆلێنزانی ئەم ڕووەکە بە ئاژەڵ دانانرێ‌و هەر ڕووەکە چونکە لە جیهانی ڕووەك جیا نابێتەوە.

لایەنگرانی پەرەسەندنی ئێستا ڕایان وایە کە ئەگەر هەر گیاندارێك پێویستی بە ئەندامێکی لاشەی خۆی نەبێت و بەکاری نەهێنێت ئەوا ئەو ئەندامە ووردە ووردە بەرەو نەمان دەچێت و دواتر ڕەنگە هەر نەمێنێت. ئەگەر سەیری قسەکەی پێشووی (إخوان الصفا) بکەین دەبینین کە هەمان بۆچوونی تیا بەدی دەکرێ چونکە دەڵێن ئەم ڕووەکە ئاو و خۆراك لە جەستە شێدارەکەی ڕووەکانی ترەوە هەڵدەمژێت جا ڕەنگە مەبەستیان ئەوە بێت کە ئەم ڕووەکە لەبەر ئەوەی خۆراکی ئامادەی دەست کەوتووە بۆیە پێویستی بەوە نەبووە ڕەگ و گەڵاکانی بەکار بێنێت بۆ دروستکردنی

خۆراك بۆیە بەرە بەرە ڕەگی کەم بۆتەوەو نەماوە. بەڵام ئەم بیروڕایە هەرگیز ناتوانێت قەناعەت بەکەسانی زانستی بهێنێت چونکە لە جەستەی زۆر لە گیاندارانـدا ئەندامی وا هەیە کە بۆ هیچ شتێك بەکارنایەت و هیچ کارێك ناکات بەڵام هیچی لێ نەگۆڕاوەو هەر لەسەر شێوەی خۆیەتی بۆ نموونە نینۆکەکانی پەنجەی مرۆڤ هیچ کارێکی پێ ئەنجام نادرێت لەلایەن مرۆڤەوە بەڵام هەروەکو خۆیەتی و بەڵکو ئەگەر کورت نەکرێتەوە درێژییەکەی مرۆڤ بێزار دەکات.

هەروەها لە نووسراوەکانی (إخوان الصفا) دا شتێکی زۆر سەیر دەربارەی کرمی (حەلزۆن) باسکراوە. بێگومان کرمی حەلزۆن ئەو کرمەیە کە لە نێو لوولەیەکی پێچ خواردووی سپی دا خۆی حەشار داوەو ڕەنگە زۆربەمان بەرچاومان کەوتبێ. لەبارەی ئەم کرمەوە دەڵێن :-

(لاوازترین و ناتەواوترین زیندەوەر کرمی حەلزۆنە کە تەنها هەستی بەرکەوتنی هەیە. ئەم کرمە لە نێو لوولەیەکی لوول پێچ دا دەژی و لە کەناری ڕووبارو کەنداوەکاندا بەدی دەکرێ. بۆ دەست کەوتنی خۆراك ئەم کرمە نیوەی جەستەی خۆی لە لوولەکە دەهێنێتە دەرەوە، ئەگەر جەستەی بەر شوێنێکی شێدار و نەرم بکەوێت ئەوا خۆراکی خۆی لێ هەڵدەمژێت بەڵام ئەگەر بەر شوێنێکی ڕەق و زبر کەوت ئەوا بە خێرایی دەچێتەوە ناو لوولەکە لە ترسی ئەوەی کە زیان بەجەستەی بگات. ئەم کرمە هەستی بینین و بیستن و بۆنکردنی نییە چونکە ویستی خوا ئەو ئەندامانەی پێ نەداوە کە پێویستی پێ نییە. ئەم جۆرە کرمە بە " ئاژەڵی ڕووەکی" دادەنرێ چونکە وەکو ڕووەك خۆراك لە خاکەوە دەمژێت، هەروەها وەکو ئاژەڵ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جوولە

دەکات. بەڵام لەبەر ئەوەی تەنها یەك هەستی هەیە بۆیە بە ناتەواوترین گیانەوەر دادەنرێت..).

بانگەوازکارانی بیردۆزی پەرەسەندن لە سەردەمی ئێمەدا باوەڕیان وایە کە (هەڵبژاردنی سروشتی) بڕیاردەری ئەوەیە کە زیندەوەران ئەندامی پێویستیان هەبێت و ئەوەی پێویستیان پێ نییە نەیان بێت، واتە ئەگەر زیندەوەرێك پێویستی بە ئەندامێك هەبێت ئەوا سروشت بۆی هەڵدەبژێرێت. بەڵام ئەگەر بڕوانینە بیروڕای (إخوان الصفا) دەبینین لە جیاتی هەڵبژاردنی سروشتی باسی (ویستی خوا) دەکات, لای ئەوان ویستی خوا لەسەر ئەوەیە کە ئەو ئەندامانەی هەبێت نەك سروشت، ئەم ڕایە زۆر لە ڕاستی نزیکترە چونکە ئەگەر سروشت ئەندامەکان بەم کرمە ببەخشێت بێگومان ئەم کرمە چاوی دەبوو چونکە پێویستی بە چاو هەیە بۆ ئەوەی ببینێت ئایا ئەم خاکە شێدارو نەرمە یان ڕەق و زبرە...

ئەم نووسراوانەو چەندین نووسراوی تری (إخوان الصفا) زۆر بە ڕاشکاوی باس لەوە دەکەن کە سەرەتای پەیدابوونی گیانداران لە گەشەسەندنی ڕووەکەوە دەستی پێکردووە. هەروەها جەخت لەسەر پەرەسەندن و گۆڕانی زیندەوەران بەهۆی ژینگە و سروشت دەکەنەوە و پەیوەندییەکی توندو تۆڵ لەنێوان جیهانی ڕووەك و ئاژەڵان دیاری دەکەن. ئەمە پوختەی بیرو ڕای گروپێکی زانستی عەرەبی بوو بەڵام لە جیهانی عەرەبیدا ئەوانە تەنیا نەبوون بەڵکو ژمارەیەکی زۆر لە ڕووناکبیرو فەیلەسووفانی عەرەب بە ڕوونی بیرو بۆچوونیان بەلای پەرەسەندن دا دەشکایەوە.

★ فەیلەسـووفی نـاوداری عـەرەبی (إبـن طفیـل) ی ئەندەلوسـی کـە لـە سـەدەی شەشـەمی کۆچـی دا لـەدایك بـووەو پسـپۆڕێکی کارامـە بـووە لـە بیرکاری و زانستی کۆمەڵناسی، ئەم فەیلەسووفە زیاتر ناوبانگی دەرکرد بە نووسینی چیرۆکی (حي بن یقظان) کە باسی کەسێك دەکات کە بـە تـەنیا لە دورگەیەك جێماوەو دەیـەوێت بزانێـت کـە ئایـا مـرۆڤ ئەگـەر بـە تـەنیا بکەوێتـە دورگـەو بیابانـەکان دەتوانێـت پشـت بـەخۆی ببەسـتێت؟ ئـەم چیرۆکەی (إبن طفیل) هیچی کەمتر نییە لە چیرۆکی (ڕۆبنسن کرۆزۆ) کە ئەمڕۆ پایەیەکی بەرزی هەیە لـەنێو ئـەدەبیاتی جیهانیـدا. ( إبـن طفیـل) لەم چیرۆکەیدا چەند ئامازەیەکی ڕوون بەلای فکـرەی پەرەسـەندن دەکات و (قەزوینی) لەکتێبی (عجائـب المخلوقـات) دا ئـەم پارچـە نووسـراوەی لـێ نەقل دەکات کە دەڵێت:-

(یەکەم قۆناغی بوونەوەران لە خۆڵ دەستی پێکرد, ئینجا کۆتایی دێت بە گیانێکی پاك. کانزاکان سەرەتا و کۆتاییان بە ڕووەکەوە بەندە, ڕووەك سـەرەتاکەی بـە کانزاکـان و کۆتاییەکـەی بـە ئاژەڵانـەوە بەنـدە, ئـاژەڵ سـەرەتاکەی بـەڕووەك و کۆتاییەکـەی بـە مرۆڤـەوە بەنـدە, مـرۆڤیش سەرەتاکەی بەئاژەڵ و کۆتاییەکەی بە گیانێکی شاهانەوە بەندە..).

ئـەم ڕایـە مـرۆڤ وا لـە قەلـەم دەدات کـە هـەردەم لـە پەرەسـەندن دایـە تاوەکو ڕۆژێك دادێت مرۆڤ دەبێتە بوونەوەرێکی باڵاو بە گیـانێکی شـاهانە دەگـات. هـەروەها پەیوەنـدی نێـوان مـاددەو ڕووەك و ئـاژەڵ و مـرۆڤ بەیەکەوە دەبەستێتەوەو سەرەتاکەشیان بۆ خۆڵ دەگەڕێنێتەوە..

★ هەروەها ڕووناکبیرو فەیلەسووفی بـەناوبانگی عـەرەبی (إبـن مسکویە الخازن) کە لـە سـەرەتای سـەدەی چوارەمی کۆچیدا ژیـاوە، لـە دوو کتێبـە

بەناوبانگەکەیدا (الفوز الأصغر) و (تهذیب الأخلاق) دا زۆر شتی سەیرو سەمەرەی زانستی لەبارەی گۆڕان و پەرەسەندنی گیانداران باس دەکات. لە کتێبی (الفوز الأصغر) دا قسەیەکی زۆر سەیر دەکات و دەڵێت:-

**(قۆناغـە لەیەکچـووەکانی مـەیموون و ئـەو ئاژەڵانـەی کـە لـە ڕووی دروست بوونی جەستەییەوە لە مرۆڤ دەچن تەنها چەند جیاوازییەکی سادەو ساکاریان لەگەڵ مرۆڤ هەیە کە ئەگەر بەسەر ئەو جیاوازییانەدا زاڵ بن یەکسەر دەبنە مرۆڤ).**

ئەم ڕایەی (إبن مسکویە) ئەوەنـدە یـەکانگیرە لەگـەڵ بیروڕای زاناکانی ئێستای بواری پەرەسەندن وەك ئـەوەی بلێـی کـە ئـەم قسـەیەی لەسـەدەی بیستەم دا کردووە. هەروەها لە هەمان کتێبدا لەبارەی ڕووەکەوە دەڵێت:-

**(ڕووەك یەکەم شت بوو کە گیانی هەبێت لەسەر زەوی دا لە پاش تێکەڵ بوونی توخم و کانزا سەرەتاییەکان. ڕووەك بەوە لە ماددە بێ گیانـەکان جیـا دەبێتـەوە کـە جوولـەی هەیـەو خـۆراك بـەکار دەهـێنێ. هەروەها ڕووەك بۆ وەرگرتنی گیـانێکی ئاژەڵانـە بـە سێ قۆناغـدا تێپـەڕ دەبێت).**

وەك لەم قسەیەدا دەردەکەوێ کە (إبـن مسـکویە) ڕای وایـە کـە ڕووەك بە چەند قۆناغێك ژیانێکی ئاژەڵانـە وەردەگرێـت. ئـەم بیرو ڕایـەش یـەك دەگرێتــەوە لەگـەڵ بیروڕاکـەی (إخـوان الصـفا) کـە داری خورمایـان بـە ڕووەکێکی ئاژەڵانی وەسف دەکرد. (إبـن مسـکویە) بـەم جـۆرە باسـی سێ قۆناغەکە دەکات:-

**(قۆناغی یەکەم بریتییە لە سەرەتای دەرکەوتنی ڕووەك لەسـەر زەوی کە پێویستی بە ڕەگ نەبوو. هەروەها تۆوی نەبوو تاوەکو جۆرەکـەی پـێ زۆر بێت چونکە ئەم ڕووەکە لە دوا قۆناغی بـێ گیـانێتی دابـوو کـە تـازە ژیانی پەیدا دەکرد. وە جیاوازی نێوان ئەم ڕووەکەو بـێ گیانـەکان تـەنها چەند جوولەیەکی کەم بوو).**

ڕەنگـە (إبـن مسـکویە) لـەم قسـەیەدا مەبەسـتی کـەڕووەکان و ئـەو ڕووەکانە بێت کە بەهۆی خانە بەکتیرییەکانەوە زیـاد دەبـن و ڕەگـەکانیان لەگەڵ قـەدو گـەڵاکانیان جیاوازییـەکی ئـەوتۆیان نییـە. هـەروەها لـەبارەی قۆناغی دووەمەوە دەڵێت:-

**(لە قۆناغی دووەمدا سیفاتی گیانداری لە ڕووەکەکاندا بەهێزتـر دەبێت و بە جۆرێك کە هێزو جوولەی دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە ڕووەکەکە لق و پـۆپی لـێ دەبێتـەوە و بـەهۆی تـۆو زیـاد دەبێـت و جۆرەکـەی خـۆی دەپارێزێت. ئەم سیفەتەش بەرە بەرە زیاد دەکات لەو ڕووەکانـەدا تاوەکو قەدو گەڵاو بەر پەیدا دەکەن و جۆرەکەیان بەهۆی تۆو زیاد دەبێت).**

ئەمە قۆناغی ناوەڕاست بوو کە ڕەنگـە مەبەسـتی ڕووەکـە دڕکاوییـەکان و گیاکان بێت. لەبارەی قۆناغی سێیەمیشەوە دەڵێت:-

**(سـیفەتی گیانـداری زیـاتر گەشـە دەکـات و بـەهێزتر دەبێـت تـاوەکو دەبێتـە دارە بـەرزو باڵاکـان کـە پێویسـتیان بـەخاکێکی پـاك و ئـاوێکی سازگارو هەوایەکی گونجاو هەیە بۆ ژیانیان، وەکو داری زەیتون و هەنار و سێو و هەنجیرو زۆرانی تر).**

(إبن مسکویە) ڕای وایە کە دارە بـەرزەکان دوا قۆنـاغی ژیـانی ڕووەکـەو سـەرەتایەکە بـۆ دەسـت پێکردنـی ژیـانێکی ئاژەڵانـە، بـەپێی بیروڕای (إبـن

مسکویە) لە کتێبەکەی تری (تهذیب الأخلاق) کاتێک ئەو دارە بەرزانە گیانێکی ئاژەڵانەیان وەرگرتووە بوونەتە هۆی دروست بوونی بچووکترین و بێ هێزترین زیندەوەر. ئەویش بەرە بەرە گەشەی کردووەو گۆڕاوە بۆ گیانداری تر بەپێی تێپەربوونی کات تا بۆتە گیاندارێکی زیرەکی وەکو مەیموون. ئەو گیاندارە زیرەکە عەقلی گەشەی کردووەو بۆتە دوا قۆناغی ئاژەڵێتی و سەرەتای مرۆڤایەتی، ئینجا گۆڕاوە بۆ ئەو مرۆڤەی کە توانایەکی عەقلی گەورەی هەیە لەسەر جیاکردنەوەو بەکارهێنانی ئەو شتانەی کە لە دەوروبەردا بەدییان دەکات.

بەم جۆرە دەتوانین بڵێین (ابن مسکویە الخازن) یەکێکە لە فەیلەسووفە ناودارەکانی مێژوو کە بابەتی زانستی وای لەبارەی گۆڕان و پەرەسەندن باس کردووە کە هیچ یەکێك لە فەلسەفەی یۆنانی و بیریارە عەرەبەکانی تر ئەم شتانەیان بە مێشکدا نەهاتووە.

★/ مێژوونووس و کۆمەڵناسی عەرەبی (ابن خلدون) کە خاوەنی پێشەکییەکی بەهێزە لە بواری کۆمەڵناسی و زنجیرەیەك لێکۆڵینەوەی سەیری کردووە لەسەر زۆرێك لە کۆمەڵگاکانی جیهان. لە توێژینەوە کۆمەڵایەتیەکانیدا (ابن خلدون) باسی ئەوە دەکات کە ژینگەو ئاوو هەوا کاردەکاتە سەر مرۆڤ و گیانداران و دەیانخاتە نێو زنجیرەیەك گۆڕانی جەستەیی.

(ابن خلدون) ئەو بیرورِا خورافیانە بە درۆ دەخاتەوە کە گوایە ڕەش پێستەکانی جیهان بریتین لە نەوەی (حام) ی کوڕی نوح. کە دەووترا پێغەمبەر نوح دوعای لە کوڕەکەی خۆی کردو ئەم دوعایە لە ڕەنگی

پێستی کاری کردو ڕەش هەڵگەڕاو ڕەش پێستەکانی ئێستا نەوەی ئەون.
(إبن خلدون) لە بارەی ڕەش پێستییەوە دەڵێت:-

**(تیشکی خۆر لە هەر ساڵێکدا دوو جار بەسەر سەریانەوە گەرمایەکی زۆر بە تینی دادەهێنا تا وای لێهات ئەو گەرمایە بۆ هەر چوار وەرز بەردەوام بوو، تیشکی خۆر زۆر بە تینێکی بەهێز لێی دەدان تاوەکو پێستیان ڕەش بوو، هەر کەسێك بڵێت ئەوانە نەوەی (حام)ن بێگومان خۆی غافل دەکات لە هۆکارە ژینگەییەکانی وەکو ساردی و گەرمی و تیشکی خۆر).**

(إبن خلدون) کاریگەری ژینگە تەنها لەسەر جەستە ناسەپێنێت بەڵکو ڕای وایە کە ژینگە کاردەکاتە سەر ڕەوشت و ڕەفتاری مرۆڤ و گیانداران، واتە ساردی و گەرمی و ئاوو هەوا ڕەنگە کار بکاتە سەر ئاستی دەروونی و هەڵچوونەکانی مرۆڤ و گیانداران بۆ نموونە شێوازی دەربڕین و گوزارشت کردن لە دڵخۆشی و تووڕە بوون و غەمباری و ڕەفتارەکانی تر..

★/ هەروەها نووسەری ناوداری عەرەبی (جاحظ) لە کتێبەکەیدا (الحیوان) ڕای وایە کە زیندەوەرە باڵدارەکانی وەکو قالۆچەو مێرووڵەو کولله و پەپولە و هەندێکی تری لەم جۆرە، سەرەتا باڵیان نەبووە بەڵام پاش تێپەڕ بوونی ڕۆژگارێك باڵیان پەیدا کردووەو بوونەتە زیندەوەری باڵدار. ئەم ڕایەی (جاحظ) بیرۆکەی دروست بوونی جۆری نوێی زیندەوەر دەدات بە دەستەوە. چونکە لێرەدا باسی پەیدا بوونی جۆری نوێی باڵدار دەکات لە جۆرە بێ باڵەکان، بێگومان سەرجەم هەوڵەکانی تیۆری پەرەسەندنی ئێستا تەنها بۆ سەلماندنی ئەمەیە..

بەم جۆرە کاتێك سەرنج دەدەین لە مێژووی دەرکەوتن و سەرهەڵدانی ئـەفکارە فەلسـەفییەکانی پەیوەسـت بـە پەرەسـەندن دەبیـنین کـە زانـا عەرەبەکانی بواری ژیاننـاسی دەچنە ڕیزی پێشەوەی فەیلەسووفانی مێژوو لـەم بـوارەدا. هـەروەها بابـەتی سـەیرو سـەمەرەی وا بـاس دەکـەن کـە زۆربەیان لەگەڵ بیروڕا زانستیەکانی ئێستای پەرەسەندن یەکدەگرێتەوە..

بیروڕای گۆڕان و پەرەسەندنی گیانداران لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تـر هـەر مایـەوەو بـووە بەشـێك لـە بـیروڕاو عەقیـدەکانی مـرۆڤ لـەبارەی چۆنیەتی پەیدابوون و دروست بـوونی بوونـەوەر. خـەڵکی ئـەوروپا زیـاتر ئەم جۆرە بـیرو ڕایانـەیان قبـوڵ دەکـردو خۆیـان بـەم جـۆرە لێکۆڵینەوانـە خـەریك دەکـرد بـەڵام لـە ناوچـەکانی ڕۆژهەڵاتـدا لەبەرئـەوەی ئـایین بـەهێزترین سەرچاوەی بیروڕاکـانی خـەڵك بـوو بۆیـە ئـەم جـۆرە فکـرەو ئایدیایانە لە نێویاندا هەرگیز جێگەی نەدەبوویەوە. پەرەسەندن و گۆڕان بیردۆزێـك بـوو کـە (خـوا) لـە هـەموو مـەخلوق و دروسـتکراوەکان دوور دەخاتەوەو وا لەقەلـەم دەدات کـە مـرۆڤ و گیانـداران و ڕووەك و گـەردوون هەمووی دروستکراوی بەر دەستی ڕێکەوتن (الصـدفة). بـەڵام لـە کۆمـەڵگا ڕۆژهەڵاتیـەکان لـە هـەر سـاتێکدا ئەگـەر فکرەیـەکی ئیلحـادی لـەم جـۆرە بەرەو ڕوویان بهاتبایە یەکسەر ڕووبەڕووی پرسـیارێکی ئەوەنـدە هەسـتیار دەبوونەوە کە زۆر لە شووشەی بلووری ناسکترە ئەویش ئەوەیە کـە دەڵێـت ﴿الست بربكم؟﴾...

سـەرەتای سـەدەی حەڤـدەم سـەرەتای نـوێ بوونـەوەی بـیروڕای پەرەسەندن بوو لە نێو زاناکاندا بە جۆرێ کـە خرایـە نێـو چوار چێوەی زانستی جۆراو جۆر کە لەو ساتانەدا زۆرێك لـە زانایـانی بـواری سروشـت و

ژیانناسی باسی گۆڕان و پەرەسەندنیان دەکرد وەکو ڕاستییەکی بڕوا پێکراو. سەدەی حەفدەم و هەژدەم زۆر کاتێکی گونجاو بوو بۆ زانایانی سروشتناسی ئەو کاتە تاوەکو بیردۆزێکی لەم جۆرە بخەنە ڕوو چونکە لەو کاتەدا زاناکان لە گەلێك ناوچەی جیا جیادا دەستیان دایە لێکۆڵینەوەو توێژینەوە لە بارەی ئەم بابەتە کە بیروڕا زانستیە لەیەکچووەکانیان بە ڕاشکاوانە مژدەی دەرکەوتنی تیۆرێکی لەم جۆرەی دەدا لەم سەدەیەدا. لە سەدەی هەژدەمدا سێ زانای سروشتناس دەرکەوتن کە لە چوار چێوەیەکی زانستی دا هەوڵی سەلماندنی بیروڕاکانی پەرەسەندنیان دەدا، ئەو سێ زانایە (لامارك) و (ئەراسمۆس) و (شارلس لایل) بوون کە بۆ یەکەمجار ئەمانە هەوڵیان دا کە بیروڕاکانی پەرەسەندن لە نێو بازنەی بیردۆزێکی زانستیدا کۆ بکەنەوە.

(باتست لامارك) ی زانای سروشتناسی فەرەنسی کە لە ساڵی (١٧٤٨ز) لەدایك بووە, سەرەتا لە گەنجێتیدا زانستی ئاینی دەخوێند بەڵام دواتر لە ڕیزەکانی سوپای فەرەنسی دا بووە سەربازو لە زۆرێك لە شەڕەکاندا بەشدار بوو، پاشان وازی هێناو ڕووی کردە خوێندنی پزیشکی و زانستی سروشت و ڕووەکناسی، لامارك لەساڵی (١٨٠٩ز) دا کتێبێکی بەناوی _فەلسەفەی ئاژەڵان– بڵاوکردەوە کە چەند بنەمایەکی دارشت بۆ داهێنانی بیردۆزێك کە باس لە گۆڕان و پەرەسەندنی گیانداران بکات، بیروڕاکانی لەم کتێبەدا سەرەتایەك بوو بۆ دەرکەوتنی بیردۆزی گۆڕان و پەرەسەندن. (لامارك) ئینکاری گشت ئایینەکانی دەکردو باوەڕی وابوو کە ژیان بە شێوەیەکی خۆیی لە ماددەی نازیندووەوە دروست بووە بەبێ بوونی هیچ دروستکارێك، (لامارك) لەخەیاڵی خۆیدا وێنەی پەیژەیەکی کێشابوو کە دەیووت گیانداران هەردەم لە پەرەسەندنی بەردەوام دان و لە

جۆرێکەوە دەگۆڕێن بۆ جۆرێکی تر بەشێوەی پایەکانی پەیژە. لە پایەی کۆتایی پەیژەکەدا مرۆڤ و مەیموون و گیاندارە زیرەکەکانی دادەنا چونکە دەیـووت ئەمانـە گەیشـتوونەتە لووتکـەی پەرەسـەندن (**قمـة التطـور**). هەروەها لە پایەی دوای ئەوانیشەوە باڵندەکانی دادەنا ئینجا خشۆکەکان و دواتر ماسی و ئینجا بێ بڕبڕەکان و کرمەکان تا دەگاتە پایەی سەرەتا کە لەوێـدا زینـدەوەری (**بۆلیـب**) ی دادەنـا. زینـدەوەری (بۆلیـب) هـیچ ئەندامێکی بەرکەوتن و هەناسەدان و زاوزێی نییە و لامارك لای وابوو کە مـرۆڤ و گشـت گیانـدارانی تـر لـە (بۆلیـب)ەوە دروسـت بـوون. وەك دەردەکـەوێ کـە (لامـارك) بـەردە سـەرەتاییەکانی بناغـەی بـیردۆزی پەرەسەندنی دانا بەڵام هەرگیز بۆی نـەکرا وەکو بیردۆزێکی زانستی بە ناوی خۆیەوە دەری بکات ...

هەروەها (ئـەراسمۆس) کـە دەکاتـە بـاوکی (شـارلس داروین) ی دانـەری بیردۆزی پەرەسەندن، بـەر لـە کوڕەکـەی بیروڕاکانی هـەر لـە هـی لامـارك دەچوو کـە ئـەویش پێشنیاری دانـانی بیردۆزێکـی لـەم جـۆرەی دەکـرد کـە باس لە گۆڕان و پەرەسەندنی گیانـداران بکـات.. (**شـارلس لایـل**) زانایـەکی زەوی نـاس بـوو کـە بـاوەڕی وابـوو پێکهاتـەو چینـە جیۆلۆجیـەکانی گـۆی زەوی هەردەم لە نوێ بوونەوەو پەرەسەندن دایـە. ئـەم زانایـە گـەورەترین پاڵپشت و پاڵنـەری داروین بـوو بـۆ دامەزرانـدن و خستنە ڕووی بـیردۆزی پەرەسەندن.

لەدوای ئەمانەو لە ساڵەکانی (١٨٠٩-١٨٨٢) زانای سروشتناسـی ئینگلیـزی (**شارلس ڕۆبرت داروین**) دەرکەوت و خۆی کردە پاڵەوان و ئەفسانەی ئـەو داستانەی کە ملیۆنەها ساڵە خـەڵکی بـۆ زانـینی سـەرەنجامەکەی وێڵـن کـە

ئەویش زانینی بنچینەی ژیانە. داروین لەسەر بناغەی بیروڕاکانی پێش خۆیەوە پۆلێك بەڵگەو دیاردەی سروشتی خستە سەریەك و بینای بیردۆزێکی پێ دارشت کە ئێستا لە قالبە گوماناوی و گریمانییەکەی دەرهێنراوەو خراوەتە نێو خانەی ڕاستیە زانستییەکان. سەرەتا داروین لە گەنجایەتیدا هەرگیز ئەوەی بە خەیاڵ دا نەدەهات کە داهێنانێکی وا بکات ناوی بباتە نێو تۆماری زاناو داهێنەران چونکە شکست هێنانە یەك لە دوای یەکەکانی داروین و ڕاوچیێتییەکەی ببوونە بەڵگە لەسەر ڕاستی قسەکەی باوکی کە ووتبووی داروین تەنها لە شەڕە سەگ و ڕاودا پسپۆڕە..

هەر لەوکاتەی کە داروین پێی خستە سەر کەشتی (بێگڵ) بە مەبەستی ئەنجام دانی گەشتە زانستییەکەی، یەکسەر کاپتن (فەتزرۆی) لووتی گرت و گوتی کەسێك خاوەنی لووتێکی وا بێت چاوەڕێی هیچی لێ ناکرێ، بەڵام ئەو کاپتنە نەیدەزانی کە ئەو لووتە بۆنی بیردۆزێکی وا دەکات کە درێژە پێدەر و زەمان حاڵی ڕێبازەکانی ماددیەت و شیوعیەت و سەهیۆنیەت و مارکسیەت دەبێت لە سەدەکانی داهاتوودا...

هیوای بەناوبانگ بوون و ناو دەرکردن سەرتاپای دڵ و دەروونی داروینی داگرتبوو، بە جۆرێك لە بیردۆزەکەیدا زۆر شتی ناهەمواری دیوە بەڵام لای نەداوە چونکە جێگەی سەرنج ڕاکێشان بووە، لەو کاتەی کە داروین هەستی کرد کەسێکی تر بە ناوی (ئەلفرێد والاس) وا بەنیازە پێش ئەو، بیردۆزەکە دابمەزرێنێت و بڵاوی بکاتەوە یەکسەر باری دەروونی شێواو زۆر غەمبار بوو لەوەی کە ئەم بیردۆزە ناوی نەباتە نێو ناوی داهێنەرانی مێژوو. داروین دەیووت گیانداران لە ململانێ و ڕکابەرییەکی بەردەوام دان بۆ دەست کەوتنی خۆراك و مانەوەیان لە ژیان

بـەڵام کاتێـك زانـی کـە زانایـەکی تـر هـەوڵ دەدات پـێش ئـەو، بـیردۆزی پەرەسەندن ئاشکرا بکات یەکسەر کەوتە ململانێیەکی توند لەگەڵ زاناکە **(والاس)** تاوەکو ناوبانگەکە بۆ خۆی بباتـەوە، کەواتـە ململانـێ لـە پێنـاو ناوبانـگ **(الصراع من أجل الشهرة)** یـەکێك بـووە لـە سیفاتە کەسییەکانی داروین نـەك ململانێ لە پێناو مانەوە **(الصراع من أجل البقاء)** ..

داروین کاتێك باسی پەرەسەندنی دەکرد زۆر بە متمانە بەخۆ بوونـەوە دەیووت گیانداران و مرۆڤ بەهۆی کاریگەری ژینگەییەوە دروست بـوون بـە رێکەوت **(الصدفة)**، بەڵام هـەرگیز متمانـەی بـەخۆی نـەبووە بڵێـت ئەگـەر بایەکی توند هەڵبکوتێتـە سـەر بلۆك و چـیمەنتۆ بـەهۆی ئـەم بایـەوە بـە رێکەوت خانوویێك دروست دەبێت لـەم کـەل و پەلانـە. بـەم جۆرە دروست بوونی مرۆڤ زۆر سووك و بێ قیمەت و سادەترە لەلای داروین لـە دروست بوونی خانوویێکی بچووك!.

داروین زۆر کاریگەر ببوو بە بیروڕای زانا سروشتناسەکانی پـێش خـۆی وەکو **(لامارك)** و **(هکسلی)** و **(شارلس لایل)**، بیروڕاکانی **(لامـارك)** دەرگـای لێکۆڵینەوە سروشتییەکانی بۆ داروین کردەوەو ئاراستەی بیرکردنـەوەکانی گـۆڕی بـەرەو بابـەتێکی ئایـدۆلۆژی کـە نـاوەرۆکی ئـەم بابەتـە زنجیرێکـی دوورو درێژەو حەلقەی یەکەمی ئەو زنجیرە زیندەوەرێکی بێ دەست و بـێ چاوو بێ هیچ ئەندامێکە، حەلقەی دووەمیش کرم و دواتر مشك و دواتـر سـەگ و گـورگ و وورچ و بـەراز و مـەیموون تـا دەگاتـە حەلقـەی کۆتـایی زنجیرەکە کە ئەویش مرۆڤە ..

مرۆڤ هەر لە دێـر زەمانـەوە دروسـتکراوێکی گـەورە و پەسـند و پـاك و پـیرۆز بـووەو هـەر مرۆڤناسـێك کـە باسـی مرۆڤـی کردبـێ وەکـو گـەورەی

بوونەوەر وەسفی کردووە، لە قورئاندا هاتووە کە خودای گەورە دەفەرموێ ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ واتە (بە ڕاستی ئێمە ڕێزێکی بێ پایانمان لە مرۆڤ ناوەو لەووشکانی و دەریاکاندا نیشتەجێمان کردووەو لە پاکترین رزق و ڕۆزییەکاندا پێمان بەخشیوە!.)، بەڵام داروین زۆر بێزار بوو لەم بیروڕایە لەبەر ئەوەی بیردۆزەکەی ئەو مرۆڤ بەنەوەو ئەولادی مەیموون و کەنغەرەکان لە قەلەم دەدات!، هەروەك دەبینین کە داروین لە کاتی نەخۆشیەکەیدا ناز لەسەر دۆستێکی دەکات و سکاڵای ئەوەی لادەکات کە دەڵێت من زۆر نیگەران دەبم کاتێك دەبینم خەڵکی باسی مرۆڤ دەکەن وەکو کائین و بوونەوەرێکی گەورە و باڵا وەسفی دەکەن ..

داروین لە ژیانیدا نیوە زیاتری تەمەنی بە نەخۆشی و ئازار بردە سەر، ئەگەر کەسێکی ژیر و بیریار لە ژیانیدا نەخۆشی و ناخۆشی ببینێت و کێشە و غەم ڕووی تێ بکات، ئەوا زۆر بە سەیری باسی ژیانت بۆ دەکات و دونیا بە خەفەت و تەنگوچەڵەمە وەسف دەکات. بەڵام داروین سەرەڕای ئەوەی کە زیاتر لە چل ساڵی تەمەنی بە نەخۆشی بردە سەر کەچی تەنها باسی پەرەسەندن و گۆڕانی جۆرەکانی گیاندارانی دەکرد. (بوذا) ئەو کەسایەتیە ئایینیەی کە لە گەنجایەتیدا سەرسام ببوو بە تەنگوچەڵەمەو ناخۆشیەکانی ژیان، دەبینین ناوەرۆکی ئایینەکەی تەنها باسی ناخۆشیەکانی ژیان دەکات و سەرجەم عەقیدەو بیروباوەڕەکانی ئایینەکەی ئەو، لەم چوار بنەمایەدا کۆدەبێتەوە کە دەڵێت (ناخۆشی هەیە،، ناخۆشی هۆکاری هەیە،، ناخۆشی چارەسەری هەیە،، ڕێگاکانی چارەسەرکردنی ناخۆشی)، بەڵام داروین لەگەڵ ئەوەی زیاتر لە چل ساڵ بەدەستی

نەخۆشیەکەی ناڵاندی هەروەها سێ شکستی گەورەی خوێندن و بەرەنگار بوونەوەی لەگەڵ چەندین رەخنەی رووخێنەر لەلایەن گشت ناوەندە جیهانیەکان کەچی بیردۆزەکەی ئەو تەنها باسی گیاندارانەو پوختەی بیروراکانی لەم چوار بنەمایەدا کۆ بۆتەوە (ململانێی مانەوە،، هەڵبژاردنی سروشتی،، خۆگونجاندنی ژینگەیی،، بۆماوە).

لە سەدە کۆنەکاندا کاتێك زاناکان هەوڵی دۆزینەوەی راستیە زانستییەکانیان دەدا، لە کاتی دەرخستنی ئەنجامەکانیان ئەگەر لەگەڵ عەقیدەو بیروڕای خەڵکی ئەوکاتە نەگونجابایە یەکسەر زاناکە گیانی دەکەوتە مەترسی. بیروراکانی (سۆکرات) لەبەر ئەوەی گونجاو نەبوو لەگەڵ فکرەکانی کۆمەڵگای یۆنانی ئەو کاتە، بۆیە درایە دادگا و بە تاوانی فریودانی گەنجان تۆمەتبار کراو لە ئەنجامدا ژەهرخوارد کرا. هەروەها گەردوونناسی بەناوبانگ (گالیلۆ) لە لایەن دەسەڵاتدارانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیەوە کوژرا تەنها لەبەر ئەوەی دەیووت (زەوی خڕە)، بەڵام داروین وەکو زاناکانی پێش خۆی، کوژران و بەندیخانەو ئازاری جەستەیی بەخۆیەوە نەدی بەڵکو هێرشێکی سەختی پڕ لە رەخنەی توندی لەدژ بەرپا بوو لە هەموو ناوەندە ئایینی و زانستیەکان کە ئەمە شێوازێکی ئازار دانی دەروونی سەخت بوو بۆ ئەو.

داروین کاتێك لەسەر کەشتی (بیگڵ) لە گەشتەکەی گەڕایەوە بۆ ئینگلترا، بە جەستەیەکی نەخۆش گەڕایەوە بەڵام لەگەڵ نەخۆشییە توندەکەیدا هەر بەردەوام بوو لە لێکۆڵینەوەی سروشتی چونکە زۆر بە تەنگ ئەوەوە بوو کە بابەتی پەرەسەندن بکاتە بیردۆزێك و بیخاتە ژێر ناوی خۆیەوە. ئەگەر لە روانگەی دەروونناسییەوە سەیری نەخۆشیەکەی

داروین بکەین بێگومان دەردەکەوێ کە نەخۆشیەکەی ئەو **(سایکۆسۆماتی)** بـووە واتـە نەخۆشـی **(دەروونـی- لاشـەیی)**، زۆرجـار بـارە دەروونیـە نارێکەکانی وەکو دڵتەنگی و غەم و ترسان و هەندێکی تـر کاردەکاتـە سـەر لەش و شوێنێکی لەش نەخۆش دەکات وەکو گورچیلە یـان سـەر یـان دڵ و بـەم نەخۆشـیانەش دەووتـرێ (سایکۆسـۆماتی)، بێگومـان نەخۆشـیەکەی داروینیش سایکۆسۆماتی بووە چونکە ئەو کارەی داروین دەیکرد بابـەتێکی وا هەسـتیاربوو کـە تـرس و دوودڵـی و دڵتـەنگی بەسـەر مـرۆڤ دا دەهێنـا. بێگومان کەسێك ئەگـەر بانگەشـەی ئـەوە بکـات کـە بـاب و بـاپیرانی مـرۆڤ بریتین لە کرم و مشك و سەگ و مەیموون ئـەوا بەرهەڵستی و دژایـەتی و ڕەخنەیـەکی سـەخت و کوشـندەی لـە دژ بـەرپا دەبێـت لـە گشـت جیهانـدا، ترسـی داروـیـن و دڵـەڕاوکێ بەردەوامەکـەی لەبـەر هێرشـی تونـدی چاوەڕوانکراوی زانایان و ئایینەکان و ڕای گشتی لەگەڵ ئەو هیواو ئاواتـەی کە داروین هەیبوو بۆ دامەزراندنی بیردۆزێکی لەم جۆرە بـارێکی شـڵەژاوی دەروونی دروست دەکات کە پێی دەووترێ **(ململانێـی دەروونـی)**، **(الصـراع النفسي)**، ئـەم شـێوانە دەروونیـەش بێگومـان کـار دەکاتـە سـەر جەسـتە و نەخۆشییەکی سایکۆسۆماتی دروست دەکـات. هـەر ئـەو بـارە دەروونییـەش بوو کە داروینی ڕاپێچی ژانەسەری توندو بێخەوی کرد..

داروین بە درێـژایی چل سـاڵ نـەخۆش بـوو کـە هـەر بـەو نەخۆشـیەوە گیانی لە دەست دا، لـە سـەرەمەرگدا تـەنها یـەك قسـەی لامـابوو کـە ووتـی **(مـن لـە مـردن ناترسـم)**، ئەگـەر دوو ملیـۆن سـاڵ پـاش مردنـی داروـیـن کەسـێکی تـر بێـت و بڵێـت گیانـداران و مـرۆڤ بـەپێی تێپـەڕبوونی کـات دەگـۆڕێن و دەبنـە گیانـداری تـر، پاشـان کەسـەکە بمرێـت و لاشـەکەی لـە تەنیشـت داروـیـن بنێـژرێ دەبیـنـین هـەردووکیان هـەر مـرۆڤن و هـیچ

جیاوازییان نییە لە کاتێکدا ماوەی نێوانیان دوو ملیۆن ساڵە. کەواتـە ئـەم دووانـە بـە بیردۆزەکانیـان هیچیان نـەکردووە تـەنها تەحـەددایان کردۆتـە سەر مرۆڤایـەتی خۆیـان. یـاخود ئەگـەر ئێستا جەستەی داروین بـەراورد بکەین لەگـەڵ لاشـە بەبەردبووەکـەی مرۆڤێـك کـە پێـنج ملیـۆن سـاڵ بـەر لەئێستا ژیاوە، دەبینین هەردووکیان یەك جۆرن و پێیان دەووتـرێ مـرۆڤا باشە ئەگەر بە ماوەی پێنج ملیۆن ساڵ مرۆڤ نـەگۆڕێ بـۆ گیانـدارێکی تـر ئەی دەبێ چ کاتێکی بووێت؟ ئەی دەبێ مەیموون بە چەند ملیارەها ملیـار ساڵ بووبێتە مرۆڤ؟ ئەی ئەو ملیۆنـەها زینـدەوەرو گیانـدارەی سـەر زەوی کە گۆڕاون بۆ جۆری تر دەبێت کاتی گۆڕانی هەریەکـەیان بـۆ یـەکێکی تـر بە چەند ساڵ بخەملێنرێ؟

زانا ماددیەکانی سـەدەی نـۆزدەم لـە پێنـاو ڕەوا کردنـی خـوێن ڕشـتن و جـەنگ بـەرپاکردن هەڵسـان بـە دارشـتنی چـەند تیـۆرێکی درۆیـی کـە بانگەشەی ئەوەیان دەکـرد کـە مـرۆڤ تـەنها جەسـتەو ماددەیـەو خالیـە لـە ڕوح و غەریزەکان. ماددیەت کاتێك دەبینێ مرۆڤ تەنها ماددەیـە ئیـدی بـە ئـارەزووی خـۆی مـرۆڤ بـەکار دەهـێنێ و ئاراسـتەی جەنگـەکانی دەکـات چونکە بـڕوای بـە لایـەنی سـۆزو تـرس و ئـەو غەریزانـە نییـە کـە لـەو مرۆڤەدا هەیە، ئەگەر کەسێك بڕوای بە هەبوونی تـرس و خۆشەویستی و بـارە دەروونـی و ڕوحیـەکانی مـرۆڤ هـەبێت ئـەوا هـەرگیز ویـژدانی قبـول ناکات سەربازێك بخاتە نێو مەیدانی جەنگ و کوژران کاتێـك دەبـینێ ئـەو سەربازە غەریزەی خۆشەویستی ژیان و ترسان لە مردنی تیایە، بـەڵام ئـەو نەزانە دڕندە ماددە بازانەی کە تۆوی ژیانیان بـەخوێنی هـەژارەکان لـەنێو خاکی تیرۆر دا چـەکەرەی کـردووە هەڵسان بـە دامـاڵینی مـرۆڤ لـە هـەموو غـەریزەو پاڵنـەرە ڕوحیـە جوانـەکان و چـاوە سـوورەکەی ئـەوان تـەنها

جەســتەو مــاددەی دەبــینی و گوێچــکەکانیان کــەڕ بــوو لــە ئاســت بیســتنی جــوانترین و ڕاســتەقینەترین سیاســەتی جــەنگ و ســەربازی کــە ئــەویش بریتییــــە لــــە ﴿ لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞ ﴾، بۆیــە دەســەڵاتدارە زۆردارەکــانی ئــەو ســەردەمە ئــەم بــیروڕا ماددیانــەیان قۆســتەوەو شــەڕەکانیان لەســەر بنەمایــەکی مــاددی بــەرپا دەکــرد. (هیتلــەر) ی نــازی بڕوایــەکی زۆر پتــەوی بــەم بیردۆزە ماددیانــە هەبوو بۆیە ئەو هەموو شەڕو داگیرکاری و کوشتن و بێ ویژدانیەی کە لە مێــژووی فەرمانڕەوایــەتی ئــەودا دەبیــنین بێگومــان دەرئــەنجامی ئــەو ئەفکارە ماددیانەیە کە خوێنی مرۆڤ حەڵاڵ دەکەن. هــەروەها (ستالین) و (مۆســـۆلۆنی) ئـــەو دوو بکـــوژو زۆردارەی کـــە ســـەرجەم ئـــەفکار و عەقیــدەکانیان ڕەش ببــوو بــە ڕەشــێتی بــیردۆزە ماددیــەکان. زانــا مــاددە پەرســتەکان لــە کــاتی بیرکردنــەوە و دارشــتنی بــیروڕاو بیردۆزەکانیــان گەورەترین کێشەیان ئەوە بوو کە (خوا) لە مێشکی مرۆڤەکان دەربهێنن و بۆیان بسەلێنن کە خوا بوونی نییە، (داروین) هەڵسا بە چارەســەر کردنــی ئەو کێشەیەو بەدیلێکی ساختەی بۆ خوا دۆزییەوە کە ئــەویش (سروشت) بوو، داروین دەیووت سروشت هەر هەموو شتێك دروست دەكات و هێزێکی بێ کۆتایی هەیە لە بوونەوەردا!

هەروەها بە چەند بەڵگەیەکی دوور لە ڕاستی و نا عەقڵانی هەوڵی دەدا قەناعــەت بــە خــەڵك بهێنێــت کــە گیانــداران بــەهۆی کاریگەرییــە ژینگەییەکانــەوە بــە ڕێکــەوت دروســت بــوون و مــرۆڤیش تــەنها نــەوەی مەیموونەکانــەو ئــەم بوونــەوەرە پێویســتی بــە هــیچ خودایــەك نییــە بــۆ

دروست بوونی. هەروەها سروشت ژیان بە هەندێك دەبەخشێت و مردن بە هەندێك دەچێژێت!

ئەم بیروڕایەی داروین شەڕی نێوان دروستکارو دروستکراو بوو بەمەش داروین گەورەترین کەلێنی بۆ ماددیەکان پڕکردەوە، ئەمەش وایکرد کە زانا ماددیەکانی ئەو سەردەمە سەرسامی و لایەنگرێتی خۆیان بۆ داروین دەربڕن و (مارکس) دانەیەکی لە کتێبەکەی خۆی (سەرمایەداری) بە دیاری بۆی ناردو لەسەری نووسیبوو _لەلایەن یەکێکەوە کە زۆر سەرسامە پێی!_

(خۆگونجاندن لەگەڵ ژینگە) یەکێکە لە چوار بناغەکەی داروینیزم، کە دەڵێت مرۆڤ و گیانداران بە پێی پێویستیان ئەندامەکانی لەشیان بۆ دروست بووە، واتە ئەو ژینگەیەی کە ئەو گیاندارەی تێدا ژیاوە وای پێویست کردووە کە باڵندەکان باڵیان هەبێت و مار لەسەر سك بڕوات و مرۆڤ دوو لاقی هەبێت و ئاژەڵان چوار لاقیان هەبێت و دڕندەکان کەڵبەو نینۆکیان هەبێت و کیسەڵ قەڵغانی لەسەر پشت بێت، تاوەکو هەریەکەیان بەپێی پێویست لەگەڵ ژینگەکەی خۆی بگونجێنێت. واتە بە کورتی داروین دەڵێت پێداویستیەکانی ژینگە ئەندامەکانی لەش دروست دەکات بەڵام ئەمە هەرگیز ناکرێ وەکو ڕاستیەکی زانستی سەیری بکرێ چونکە ئەگەر ئەمە ڕاست بووایە ئەی بۆچی (کەنغەر) دوو لاقی پێشەوەی کورتەو ناگاتە زەوی بۆیە بە بازدان ڕادەکات لە کاتێکدا ئەو لە ژینگەکەیدا پێویستی بەوە هەیە کە بە خێرایی ڕا بکات؟. بۆچی کەنغەر بە گوێرەی پێداویستی ژینگەکەی، دوولاقی پێشەوەی درێژ نەبووە تاوەکو بەخێرایی و ئاسایی ڕابکات و خۆی لەگەڵ ژینگەکەی

بگونجێنێت؟. یاخود ئەگەر ئەمە ڕاست بووایە دەبووایە مەیموون باڵی هەبوایە چونکە مەیموون لە ژینگەی دارستاندا خۆی بۆ سەر دارەکان فڕێ دەدات و بێگومان بە گوێرەی پێداویستی ژینگەکەی، مەیموون پێویستی بە باڵ هەیە تاوەکو بە ئاسانی بفڕێ لە نێوان دارەکان نەك خۆی هەڵبدات..

بێگومان ئەم بیروڕایەی داروین وەك ئەوە وایە کە مام حاجیەکی دەشتی هەولێر لاقێکی تری بۆ دروست بێت و ببێتە سێ لاق تاوەکو پێویستی بە گۆچان نەبێت و بەرنەبێتەوەو لەگەڵ ژینگە خۆی بگونجێنێت!.

لە ساڵی (١٨٥٩) ز دا بەناوبانگترین کتێبی داروین (اصل الأنواع) لە لایەن داروینەوە بڵاوکرایەوەو یەکەم قۆناغی ژیانی بیردۆزی پەرەسەندن دەستی پێکرد. ئەم کتێبە سەرەتا شتێکی سەیرو نامۆ بوو بەڵام دواتر لایەنگری زۆری پەیدا کردو بووە یەکێك لە داهێنراوە گرنگەکانی مرۆڤایەتی، ئەم کتێبە گشت بیروڕاکانی داروینیەتی تێدا کۆکراوەتەوەو بە مەنهەج و مەرجەعی سەرەکی قوتابخانەی داروینیەت دادەنرێ..

دیارترین و بەرچاوترین فاکتەری پەرەسەندن کە لەم کتێبەدا زۆر جەختی لەسەر کراوەتەوە (هەڵبژاردنی سروشتییە)،. ئەم کتێبەی داروین لە لایەن لایەنگرانیەوە پێشوازییەکی گەرمی لێکراو خەریکە لە ڕۆژئاوا وەکو کتێبی پیرۆز سەیری دەکرێ، هەروەها ئەم کتێبە وەرگێڕراوەتە سەر زۆربەی زمانە جیهانیەکان و بێگومان ناوبانگی ئەم کتێبە لەبەر ئەوە نییە کە ناوەرۆکێکی زانستی ڕاستەقینەی هەبێت بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە زۆرێك لەئەفسانەو حیکایەتەکانی پێشوو، وەکو ئەسپی باڵدار و ماری

حەوت سەرو چێڵی باڵدارو پشیلەی بێ کلك و گۆڕانی مار بۆ ئەژدیهاو زۆر شتی تر لەم کتێبەدا وەکو ڕاستییەکی زانستی نووسرابوونەوە..

★ بەم جۆرە لە کاتی لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە بارەی قۆناغەکانی دەرکەوتنی بیردۆزی پەرەسەندن بۆمان دەردەکەوێ کە فکرەی پەرەسەندنی گیانداران و بیردۆزی پەرەسەندن حەبلێك بوو کە فەیلەسووفە کۆنە یۆنانییەکان سەرێکیان گرت و سەرەکەی تریان هاویشتە مەیدان تاوەکو لە ساڵی (١٨٥٩)ز شارلس داروینی ئینگلیزی سەرەکەی تری گرتەوە...

# بەشی سێیەم

## پــوختــەی ژیانــی داروین و چۆنیەتــی پێگەیشتنــی

ناسینی ژیاننامەو کەسایەتی هەر پەیام هێنەرو داهێنەرێك گەورەترین و گرنگترین مەرج و بناغەیە بۆ بڕیاردان لەسەر ئەو بەرنامە یان ئەو بیردۆزەی کە کردوویەتی بە میراتی دوای خۆی تاوەکو لە ڕێگەی ناسینی مەبەست و ڕەوشت و بەسەرهاتەکانی ژیانیەوە بتوانین بڕیار بدەین کە ئایا ئەمەی بۆ بەرژەوەندی و خزمەتی مرۆڤایەتی داهێناوە یاخود ئەم داهێنراوە لە ناخێکی پڕ حەزی ناودارێتی و بەناوبانگ بوون (الشهرة) چەکەرەی کردووە!..

جا بۆیە بەر لە چوونە ناو باسەکانمان، بە پێویستی دەزانم چەند تیشکێك بخەمە سەر ژیانی دامەزرێنەری بیردۆزی پەرەسەندن **(شارلس ڕۆبرت داروین)** تاوەکو لە ڕێگەی ناسینی بەسەرهاتەکانی ژیانیەوە خۆی و تیۆرەکەی بناسین..

زانای سروشتناس و بایۆلۆجی **(شارلس داروین)** لە ١٢ ی شوباتی ساڵی ١٨٠٩ ی زایینی لە دایك بوو کە دووەمین کوڕی **(ڕۆبرت وارنج داروین)** بوو، دایکی ناوی **(سوزانە ودجود)** بوو کە کچی یەکێك لە خاوەن کارگەکانی ئەوکاتە بوو لە بواری **(گلکاری)** دا کە ئەوکاتە ناوبانگێکی

زۆری هەبوو. باوکی داروین دکتۆرێکی ووشیارو بڕوا پێکراو بوو، داروین لە ژیانێکدا دەژیا کە تا ڕاددەیەك پێداویستیەکانی ژیانی بۆ فەراهەم ببوو. لەتەمەنی هەشتساڵیدا دایکی کۆچی دوایی کرد. دایکی ژنێکی هۆشیارو خاوەن ڕەوشت و ڕەفتاری جێگیرو پتەو بوو هەر بۆیە نەوەکانی زۆرێك لە سیفاتی ئەویان تێدا بەدی دەکرێ، دەگێڕنەوە جارێکیان داروین لە کاتی چوونی بۆ قوتابخانە گوڵێکی لە دەست بوو دەیووت دایکم فێری کردووم کە چۆن سیفەتەکانی ڕووەك بزانم لەکاتی سەیرکردنی ناوەوەی گوڵ!.. لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا، زاناکانی بواری بۆماوەزانی بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە بۆماوە بابەت و سیفاتی بلیمەتی و زیرەکی لەدایکەوە دەگوازرێتەوە بۆ نەوەکان. بەڵام ئەم بیروڕایە ئەگەر ڕاستیش بێت ئەوا لەسەر داروین جێبەجێ نابێت چونکە باوك و باپیری داروین هەر لەم بوارەدا پسپۆر بوون کە داروین خۆی تێدا کردە پسپۆر. باوکی دکتۆرێکی وابوو کە خاوەن کەسایەتییەکی سەربەخۆو ووردبین و زوو هەست کردن بوو، جا بۆیە وا دەردەکەوێت کە داروین ئەم سیفەتەی لە باب و باپیرانەوە دەستکەوتبێ نەك لە بۆهێل و بۆماوەی دایکییەوە. باوکی داروین خولیای لێکۆڵینەوەی زانستی زیندەوەران و سروشتناسی بوو. جێی تێڕامانە کە پێش لەدایك بوونی داروین، بانگەشەی گۆڕان و پەرەسەندنی جۆرەکانی زیندەوەرانی دەکرد، پاڵپشتی و بەرگری ئەو، بناغەو پشتیوانێك بوو بۆ سەرهەڵدانی بیروڕاکانی (لامارك) کە ئەویش بیروڕاکانی هەر لە هی داروین دەچوو.

داروین لە گەنجایەتیدا هیچ نیشانەیەکی وای پێوە دیار نەبوو کە بلیمەتی و زیرەکی ئەو بسەلمێنێت، هیچ نیشانەیەکی داهێنانی زانستی

پێوە دیار نەبوو، نە باوکی و نە هاوڕێیانی چاوەڕێی هیچیان لێ نـەدەکرد. چەندین جار لـە پرۆسـەی خوێنـدنـدا شکستی هێنـاوەو هـەردەم خـۆی بـە ڕاوکردن و ڕابواردن و سواری ئەسپ خـەریك کـردووە تەنانـەت جارێکیـان باوکی لە وەسـفیدا ووتـی (دارویـن لـە هـیچ شـتێك سـەرناکەوێ تـەنها لـە شەڕە سەگ و ڕاوچێتیدا!). بـەڵام ئـەو نهێنیـەی کـە داروینی گەیانـدە نـاو بازنەی داهێنان و ناوی خستە ناو تۆماری نـاوداران، ئـەوە بـوو کـە دارویـن کەسێکی ئەوەندە بە ئـارام و پتـەو و بەتەحـەممول بـوو، بەرگـەی هـەموو ڕەخنەو کەم و کوڕییەکانی دەگـرت و گـوێی پـێ نـەدەدا، هـەروەها دارویـن دەستی دایە نووسین و لێکۆڵینەوە لە بـارەی زانستێکی وا کـە زاناکـانی تـر هەرگیز نەدەوێران بانگەشـەی بـۆ بکـەن لەترسـی هەڵسانی ڕەخنـەو ڕقـی مرۆڤایەتی، بەڵام داروین ئەم هەڵەی قۆستەوە و لـە مەیدانەکـەدا کەسـیتر نەبوو ململانێی لەگەڵ بکات بەڵکو هەر خۆی تەنیا بوو، بۆیـە کتێبەکـەی داروین بە یەکەم کتێب دادەنرێـت کـە لـەم بـوارەدا نووسـرابێت و بەمـەش داروین ناوی خۆی بە بەرگوێی هەموو خەڵکی قاڕەی ئەوروپادا چرپاند...

ڕەنگە هـەر یـەکێکمان کـە گوێمـان لـە ووشـەی (زانـا) دەبێـت نموونـەی کەسێکمان دێتەوە یاد کە قۆناغەکانی خوێندنی بـە سـەرکەوتوویی بڕیـوە و زانکۆیەکی ناوداری تەواو کردووەو بڕوانامەیەکی بـەرزی لـە بوارەکەیـدا دەست خستووە. بەڵام داروین بە پێچەوانەی هـەموو ئەمانـە بـوو کـە سـێ جاری یـەك بـەدوای یـەك شکستی هێنـا لـە سـێ خوێنـدنگاداو دواتـر وازی هێنا. ئێستاش با هەندێك باسی قۆناغەکانی خوێندنی بکەین.

★ داروین لـە سـەرەتادا لەگـەڵ بـرا گەورەکـەی خـۆی دەسـتیان کـرد بـە لێکۆڵینـەوە دەربـارەی کیمیـای زانسـتی. بـە درێـژایی ڕۆژ تاقیکردنـەوەی

لەسەر گازەکان دەکرد لە کارگەیەکی بچووکدا، تا وای لێهات کە دۆستەکانی ناویان نابوو (مستەر گاز). بەڵام خولیای شتێکی تریش بوو ئەویش خوێندنەوەی بابەتە ئەدەبییەکان بوو. زۆر حەزی لە هۆنراوە و کتێبەکانی (شکسپیر) و (ولترسکوت) و (بیرون) دەکرد...

★ یەکەم خوێندنگا کە داروین تیایدا دەستی بە خوێندن کرد قوتابخانەی (شراوزبەری) بوو. (شراوزبەری) ناوی شارێکە لە ئینگلترا کە داروین هەر لەم شارەدا لەدایك بوو. ئەم قوتابخانەیە بۆ داروین سوودێکی زۆری نەبوو چونکە سروشتی داروین لەگەڵ بوارو بابەتەکانی ئەم قوتابخانەیە نەدەگونجا. ئەو زانستانەی کە لەم خوێندگایەدا دەخوێنران هەمووی شتی کۆن بوون و زیاتر پەیوەست بوون بە ئەدەبی کۆن. هەروەها زانستی جوگرافیاو مێژووی کۆنی بە کەمی تێدا دەخوێنرا.

داروین بۆ ماوەی حەوت ساڵ لەم قوتابخانەیە خوێندی بەڵام هیچ سوودێکی زانستی بۆی نەبوو تەنیا هەندێك بابەتی ئەدەبی نەبێت کە بە زۆر پێیان لەبەر دەکرد چونکە سیستەمی ئەو قوتابخانەیە وابوو کە هەرچی قوتابی دەیخوێنێت دەبێت لەبەری بکات.

داروین لەبارەی ئەم قوتابخانەیە ووتی:

**ئەم خوێندنگایە بە ناو، پەیمانگایەك بوو بۆ دەستکەوتنی زانست، بەڵام تەنها کات بە فیڕۆدان و شتی پڕوپووچ بوو!**

دەستەی وانە بێژانی ئەم قوتابخانەیە هیچ داناییەك و سوودێکی زانستیان لە داروین بەدی نەدەکرد بۆیە داروین لەم خوێندنگایە هاتە دەرەوەو وازی هێنا بەبێ دەستکەوتنی هیچ زانست و زانیارییەك!

★ لەسالّی (١٨٢٥) ز پاش ئەوەی باوکی بۆی دەرکەوت کە داروین بە تەواوی شکستی هێناوە لەم قوتابخانەیەدا، یەکسەر گواستیەوە بۆ زانکۆی (ئادنبرە) بۆ خوێندنی زانستی پزیشکی. هەر لەم زانکۆیەدا (ئەراسمۆس) ی برای قوتابی بوو لە هەمان بواری پزیشکی. ئەراسمۆس کەسێکی لاوازو تا ڕاددەیەك نەخۆش بوو، هەر ئەمەش وای کرد کە ئەویان ناوبانگ پەیدا نەکات لە بوارەکەیدا. بەڵام لە ڕووی زانست و زانیارییەوە خاوەن زانیارییەکی زۆر بوو، شارەزایی لە زۆر شتدا هەبوو. بێگومان ئەمەش هاندەرێکی گەورە بوو بۆ داروین تاوەکو بە قووڵایی بابەتە سروشتیەکان دا بچێت.

بۆ ماوەی دووساڵ داروین لەم زانکۆیەدا درێژەی بە خوێندن دا بەڵام لێرەشدا ماف خوێندنی بە تەواوی نەدا، چونکە دەروونێکی ئەوەندە سەیری هەبوو بە جۆرێك کە دکتۆرو وانە بێژانی ئەم زانکۆیەو شێوازی وانە ووتنەوەیان کاریگەرییەکی سلبی گەورەی لەسەر داروین هەبوو. ڕقی لەوە بوو کە بچێتە ناو هۆڵەکانی خوێندن و هەرگیز جورئەتی نەدەکرد کە لە هۆڵی پراکتیکی توێکاری (تشریح) خۆی ڕابگرێت. ڕق و کینەیەکی توندی هەبوو بەرامبەر وانەو وانەبێژەکان هەتا وای لێهاتبوو کاتێك وەسفی مامۆستاکانی وانەی (تشریح و جیۆلۆجی و زانستی ئاژەڵان) ی دەکرد دەیووت:

ئەو مامۆستایانە وام لێ دەکەن کە هەرگیز کتێبێکیش نەخوێنمەوە کە باسی ئەم زانستانە بکات!

هەر چۆنێك بێت داروین تەنها دوو ساڵی لەم زانكۆیەدا بە فەرامۆشی بەسەر بردو دواتر بە دەست بەتاڵی و بە بێ دەستكەوتنی هیچ زانستێك لەم زانكۆیە هاتە دەرەوەو وازی هێنا. ئێستا ئێمە ئەگەر هەڵوەستەیەك لە سەر ئەم وازهێنانەی داروین بكەین دەبینین كە وازهێنانی داروین لەبوارە پزیشكییەكەدا دوو زەبری گەورەی لەداروین داوە، یەكەمیان ئەوەیە كە ئەم سەرنەكەوتن و شكستەی داروین بووە یەكەم خاڵی ڕەخنە گرتن لەخۆی و تیۆرەكەی، چونكە بیردۆزی پەرەسەندن بە پلە یەك پشت بە زانستی پزیشكی دەبەستێ هەروەها بە توێكارزانی و پێكهاتەی جەستەیی گیانداران ئیتر چۆن دەكرێ بەڵگە پزیشكییەكانی داروین ببنە بەڵگەی پەیدا بوونی ژیان لە سەر زەوی بەهۆی (الصدفة) لەكاتێدا كە داروین خۆی لە پزیشكیدا سەرنەكەوت. دووەمیان ئەوەیە كە داروین لەم زانكۆیەدا بەهۆی مامۆستاكانەوە ڕق و كینەو دوژمنكارییەكی سەختی بۆ دروست بوو بەرامبەر زانستی (جیۆلۆجی) لە كاتێكدا كە ئەم زانستە پتەوترین بناغەو مەرجی سەلماندنی ئەو فكرەو یاسایانەیە كە سروشتناسێكی وەكو داروین بانگەشەی بۆ دەكرد. جیۆلۆجی واتە زەوی ناسی بریتیە لە زانستی شارەزا بوون لە پێكهاتەو چینەكانی گۆی زەوی و گرنگترین بابەت كە جیۆلۆجیا بەدواوەیەتی بریتییە لە زانستی ناسینەوەو دیاریكردنی تەمەنی گیاندارە بەبەردبووەكانی نێو چینەكانی زەوی (المتحجرات) كە ئەمە گەورەترین ئەركی سەرشانی داروین بوو بۆ سەلماندنی بیردۆزەكەی. بەڵام داروین تەنها بەهۆی ڕەفتاری مامۆستایەك دەیووت كتێبێكیش ناخوێنمەوە كە باسی جیۆلۆجیا بكات!.

هەروەها داروین لە ماوەی خوێندنی لە زانکۆی (ئـادنبرە) دا گشت ئـەو زانسـتە ئەدەبییانـەی لـە بـیر چوبوویەوە کـە پێشووتـر لـە قوتابخانەکـەدا خوێندبووی تەنها چەند پیتێکی ئەبجەدی یۆنانی لە یاد مابوو.

★ لە دوای دوو شکستی گەورەی یەك بە دوای یەك، باوکی بڕیاریـدا کـە بیگوێزێتـەوە بۆ کۆلێـژی (لاهوت) لـە زانکۆی (کـامبریـج) لـە نۆکتۆبـەری سـاڵی ١٨٢٧ز. داروێـن چـووە نـاو قۆنـاغی سـێیەمی خوێنـدن کـە ئـەویش خوێنـدنی زانسـتی لاهـوتی پەیوەسـت بـە ئـاینی مەسـیحیەت بـوو کـە دەرچـووانی ئـەم کۆلێـژە هـەموویان وەك قەشـە (القسـیس) لەخزمـەتی کڵێسادا دەبوایە کار بکەن. خوێندنی لاهوت جێگەی گرنگی پێـدانی بـاوکی بوو، چونکە باوکی زۆرحـەزی دەکـرد کوڕەکـەی وەکو پیـاوێکی ئـایینی لـە خزمەتی کەنیسـەدا کاربکات. بـاوکی پیـاوێکی دینـدارو ئـاین پـەروەر بـوو بۆیـە هیـوای وابـوو کـە کوڕەکـەی ببێتـە قەشـەو خزمـەتکاری ئـایینی مەسـیحیەت بـەڵام هـەرگیز نەیـدەزانی داروێـن ئـەو گەنجەیـە کـە لـە داهاتوودا لـە پێنـاو دەسـتکەوتنی ناوبانگێـك بـە بیردۆزێکـی تـەم ومـژاوی، دەبێتـە دوژمـنی سەرسـەختی کەنیسـەو مەسـیحیەت و ئینجیـل و عیسـای کوڕی مەریەم. داروین ئەو کەسە بوو کە دوو بواری جیاجیـای زانسـتی بـە فەرامۆشی وەرگرت و وازی لێهێنا. یەکێکیان زانسـتی ئـەدەبی و ئـەویتریان زانستی پزیشکی، ئیتر کەسێك کە نەتوانێت خـۆی بگونجێنێـت لەگـەڵ دوو بواری زانستی، ئایـا دەتوانێـت لـە زانسـتی ئاینیـدا سـەرکەوێ کـە خـۆی تـا ڕادەیەك لەگـەڵ ئـاین نـاکۆك بـوو؟ بـە هـەر حـاڵ داروێـن بـۆ سـێیەم جـار شکستی هێنـاو لە خوێندنی لاهوتیش دەسـتی کێشـایەوە. داروێـن لـە بـارەی ئەم زانکۆیەوە دەڵێت: (ئەو سێ ساڵەی تەمەنم کە لە زانکۆی (کـامبریج)

بەســەرم بــرد بــە فــیڕۆ چــوو، ئــەویش هــەروەکو زانکــۆی (ئــادنبرە) و خوێندنگاکەی پەکەمم وا بوو) بەم جۆرە داروین لە هەر بوارێکدا شکستی دەهێنــا دەیــووت بــێ ســوودو کــات بــە فــیڕۆدان بــوو، ئێســتا ئێمــە ئەگــەر هەڵوەستەیەك لەسەر بارە دەروونیەکـەی داروین بکـەین، هەسـت دەکـەین کە نهێنیەکی شاراوە بـە دواوەی ئـەم وازهێنـان و شکست هێنانـە یـەك بـە دوای یەکانەی داروین هەیە. دەبێت شتێکی تر هـەبێت کـە داروین هێشـتا پێـی نەگەیشـتووە. کەسێك کـە سـێ بـواری جیاجیـای زانسـت بـە شـتی نـا گرنگ و سووك بزانێت و وازی لـێ بهێنێت و بڵێت تـەنها کـات بـەفیڕۆدان بوو، ئیتر دەبێت حەزێکی تر هەبێت لە دڵیدا کە هێشتا پێی نەگەیشتووە، یاخود بوارێکی تـری زانستی لا پەسندتر بێت لـە هـەموو بوارەکـانی تـر. ئەگـەر سـەیری کتـێبی وەرگێـڕراوی داروین (أصـل الأنـواع) بکـەین ئـەو ڕاستیەمان بە ڕوونی بۆ دەردەکەیٚ.

إسماعیل مظهر کە وەرگێڕی کتێبەکەیە دەڵێت:-

(داروین هەر لە منداڵیەوە زۆر حەزی دەکرد زینـدەوەران کـۆ بکاتـەوە، کە ئەمەش حەزێکە گشت زانایەکی بواری ئاژەڵ و ڕووەك و سروشتناسی هەیەتی. هەر لە تەمەنی منداڵییەوە مێرووی کۆ دەکردەوە، سەرەتا لەگەڵ خوشـکەکەی پێشبرکێی کۆکردنـەوەی زۆرتـرین مێروویـان دەکـرد، بـەڵام دواتر هەوڵی دەدا جۆرە جیاوازەکانی مێروو کۆبکاتەوە. هەروەها زۆر جار لەسەر پشتی ئەسپەکەی دەردەچوو بۆ ڕاوکردنی ئاژەڵان و بەدەوروپشـتی گونـدەکاندا دەسووڕایەوە. ئەمـەش قسـەکەی باوکیمـان دێنێتـەوە یـاد کـە پێشتر ووتبووی داروین تەنها لـە ڕاوکـردن و ئـاژەڵ گـرتن سـەردەکەویٚ). بەم جۆرە دەبیـنین کە داروین سەرتاپای ژیانی لە جیهانی ئاژەڵاندا بەسەر

بردووەو بە نووکی قەڵەم بەدواوەی ڕاوی زانستی ئاژەڵانەوە بووەو ئەمەش ڕاستی قسەکەی باوکی دەردەخات!.

بەڵام داروین بە مێشکێکی فەلسەفی و زانستییەوە بە دواوەی ڕاوی ئاژەڵانەوە بوو تاوەکو لەسەر بنەمای لێکۆڵینەوەی گیانداران بیردۆزێك دابڕێژێت کە کارل مارکس و ئەدۆلف هیتلەر سوودمەندی یەکەمی ئەم بیردۆزە بن. گەنجێك کە خولیای مێروو کۆکردنەوەو ئاژەڵ گرتن بێت چۆن دەکرێ لە خوێندنی ئەدەبیاتدا سەرکەوێ. یاخود چۆن دەکرێ بۆت ببێتە پزیشك و سەرکەوتن تێدا بەدەست بهێنێ، یان دەکرێ بیدەیتە بەرخوێندنی زانستی لاهوت و تەبشیری نەسرانیەتت بۆ بکات؟. بێگومان ئەمانە هەر هەمووی مەحاڵە! کۆکردنەوەی زیندەوەران و زانستی سروشت و ژیان تاکە هیواو ئومێدی سەرکەوتنی داروین بوو...

داروین لەبەر ئەوەی لە زانکۆی (ئادنبرە) دا زۆر ناکۆك بوو لەگەڵ وانە بێژی وانەی (جیۆلۆجی) بۆیە بڕیاری دابوو کە هەرگیز ئەم زانستە نەخوێنێت و کتێبێکیش نەخوێنێتەوە کە باسی جیۆلۆجیا بکات. شایانی باسە زانستی جیۆلۆجیا یەکێکە لەو زانستانەی کە پێویستە گشت زانایەکی بواری سروشتناسی شارەزایی لێی هەبێت، چونکە جیۆلۆجیا واتە (زەوی ناسی) زانستی لێکۆڵینەوەیە لە گۆی زەوی لەڕووی پێکهاتن و مێژووی دروست بوونی و پەیوەندی ئەم زەوییە بە هەسارەو ئەستێرەکانی ترەوە. هەروەها باس لە چۆنیەتی دروست بوون و کەڵەکە بوونی چینەکانی گۆی زەوی و دۆزینەوەی کانە نەوتیەکان و هۆکارو پێشهاتەکانی برکان و زەوی لەرزەو گشت جۆرەکانی بەردی ئاگری و بەردە نیشتووەکان و بەردە گۆڕاوەکان دەکات کە ئەم زانستانە زۆر گرنگ

و پێویست بوون بۆ کەسێکی وەکو داروین کە هەوڵی زانینی بنچینەی ژیانی دەدا. بە تایبەتی زانستی (**بەبەردبوون و تۆماری بەبەردبووەکان**) (**التحجر والمتحجرات**) کە گرنگترین بنەمایە بۆ فەلسەفەی زانینی بنچینەی ژیان. چونکە داروین بانگەشەی گۆڕانی گیانداران دەکات لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر، جا بەم پێیە پێویستە نموونەی هەندێك لەو گیاندارانە لەبەر دەست دابن کە ملیارەها ساڵ پێش ئێستا ژیاون تاوەکو داروین بیسەلمێنێت کە مرۆڤ و ئاژەڵانی ئێستا بریتین لە دەرەنجامی گۆڕانی گیاندارانی پێشوو. بێگومان نموونەی ئەو گیاندارە کۆنانە لە ڕێگەی گەڕان بەدوای بەبەردبووەکاندا دەست دەکەون. چونکە ملیۆنەها ساڵ بەر لە ئێستا زیندەوەران و گیانداران کاتێك مردوون، وورده وورده لەژێر خاکدا خۆڵ چۆتە پێکهاتەیانەوەو لاشەیان شی بۆتەوەو خۆڵ جێگەی ئەندامەکانی لەشی گرتۆتەوەو شێوازێکی تەواوی ئەو گیاندارە لە خۆڵ دروست بووە. ئەم گیاندارە بەردینییە پێویستە بدۆزرێتەوەو بەراورد بکرێ لەگەڵ هەمان جۆری ئێستای گیاندارەکە، بۆ ئەوەی جیاوازی نێوانیان دیاری بکرێت. ئەمڕۆ زۆرێك لە زەوی ناسان بە بەڵگەی گیاندارە بەبەردبووەکان بیروڕاکانی داروین ڕەت دەکەنەوە چونکە لە نێوان ئەم بەبەردبووانەو گیاندارانی ئێستادا هیچ جیاوازی و گۆڕانێك نابینن.. بەم جۆرە دەبینین کە جیۆلۆجیا مەرجی سەرەکی سەلماندنی بیروڕاکانی داروین بوو بەڵام داروین ئەو زانا سروشتناسە بوو کە بڕیاری وازهێنان و نەخوێندنەوەی زانستی جیۆلۆجیای دابوو. زانای ڕووەکناس (**هنسلۆ**) وای لە داروین کرد کە پاشگەز بێتەوە لەم بیروڕایەو دەست بداتە خوێندنی زانستی جیۆلۆجیا، (هنسلۆ) وای لە داروین کرد کە

بەشـداری بکـات لـە گەشـتێکی زانسـتی لەگـەڵ قوتابیـانی بەشـی زانسـتی جیۆلۆجی بەمەش داروین توانی بە شێوەیەکی پراکتیکی زانیـاری گـرنگ لەبارەی جیۆلۆجیـا وەربگرێـت کـە ئەمـە بـووە یەکـەم هانـدەری داڕشـتنی تیۆرەکەی. هەروەها (هنسلۆ) داروینی قوتابیە تازەکەی خۆی هاندا تـاوەکو کتـێبی (بنـەماکانی جیۆلۆجیـا) بخوێنێتـەوە کـە (شـارلس لایـل) ی زانـای زەوی ناس دینابوو. (هنسلۆ) یەکێك بوو لەو زانایانەی کە باوەڕیان وابـوو گـۆی زەوی هـەر جارەو لـە پـاش تێپـەڕ بـوونی زەمـەنێك، تووشـی چـەند ڕووداوێك دەبێت و هەرچی لە سەریەتی لەناو دەچێت و دواتر زەوی نـوێ دەبێتەوە. بەڵام (شارلس لایـل) ئـەم بـیردۆزەی هەڵوەشـاندەوە. بـەم جـۆرە دەبیـنین کـە زانـای ڕووەکنـاس (هنسـلۆ) بـیرو هـزری داروینـی بـە تـەواوی گۆڕی و ئاراستەی لایەکی تری کرد، دەتوانین بڵێین یەکەم خشتی داناوەتە بناغـەی بیردۆزەکـەی داروین هـەروەك دەبیـنین کـە داروین خۆیشـی دان بـەوە دا دەنێـت، کاتێـك هنسـلۆ مـرد لـە سـاڵی ١٨٦١ ز داروین لـە وەسـفیدا ووتی:-

**(هنسلۆ مامۆستای کۆنی خۆشەویستم بوو لە سروشتناسیدا)**

★ لـە سـاڵی ( ١٨٣١ز) دا گەشـتێکی زانسـتی ئـەنجام درا لـە سـەر کەشـتی جەنگی (بیگڵ) کە پێـنج سـاڵی خایانـد. ئـەم گەشـتە پۆلێـك لـە زانایـانی جیۆلـۆجی و سروشتنـاسـی و ڕووەکزانـی و چـەندین بـواری تـری تێـدا بەشدار بوو، کە نیازیان وا بوو سەردانی کەنارەکانی (ئەمەریکای باشور) و ئەو ناوچانە بکەن کە دیاردەی جیۆلۆجی و زانستی هەمـە چەشـنی تێـدا بـەدی دەکـرا. کـاپتنی ئـەو کەشـتیە کـە نـاوی (فـەتز ڕۆی) بـوو کەسـێکی دینـدارو تـا ڕادەیـەك تـوڕەو تونـد بـوو، لـە سـەرەتای گەشـتەکەدا هنسـلۆ

پەیمانی بە کاپتن (فەتز ڕۆی) دا کە گەنجێکی بۆ بنێرێت کە شارەزا بێت لــە سروشتناســی و زانســتی لێکۆڵینــەوەی ئاژەڵــان بــۆ ئــەوەی بەشــداری گەشتەکەیان بکات. بێگومـان مەبەسـتی لـەو گەنجـە (دارویـن) بـوو، دواتـر هنسلۆ نامەیەکی بۆ ناردو ووتی:

(لەبەر ئەوەی تۆ کەسێکی ئارام گری لەسەر کۆکردنەوەی زیندەوەران و لێکۆڵینەوەیان، بۆیە بە شیاوترین کەست دەزانم بۆ بەشداربوونت لـەم گەشتە.) داروین لە سەرەتادا لە لایەن باوکیەوە ڕێگری لێ کـرا لـەوەی کـە لە گەشتەکەدا بەشدار بێت بەڵام بە هەرحاڵ گوێی بە هیچ ڕێگرێك نەداو بڕیاری ئەنجام دانی ئەو گەشـتە زانسـتییەی دا. کـاپتنی کەشـتیەکە (فـەتز ڕۆی) هەر لەگەڵ بینینی داروین یەکسەر ڕەتی کردەوە کە لەگەڵ خۆیانـدا ببیـات، (فـەتز ڕۆی) لەبـەر چـاوی هـەموو سەرنشـینانی نـاو کەشـتیەکە (لـووت) ی دارویــنی گــرت و بــە دەنگێکــی بــەرز ووتــی: کەســێك خــاوەنی لــووتێکی وابێــت، چــاوەڕێی هیچــی لــێ ناکرێــت!، ئــەم ڕەفتــارەی کــاپتن فەتزڕۆی گەورەترین ڕەخنەی ڕووخێنەربوو کە دارویـن تـا کۆتـایی ژیـانی هــەر لــە یــادی مــابوو، چــونکە کوشــندەترین زەبــری لــە وورەو توانــا دەروونییــەکانی دارویــن دابــوو. دارویــن لــە پــاش داڕشــتنی بــیردۆزی پەرەســەندن و بــەناوبانگ بــوونی لــە یــەکێك لــە نووســراوەکانی خــۆی کــە تایبەتە بە یادەوەری و یاداشـتەکانی ژیـانی ئەمـەی نووسـی: {ئـەمڕۆ مـن باوەڕم وایە کە ئەو بیروڕایەی کاپتن (فەتز ڕۆی) هەیبوو لە بارەی لووتی مـن، هەڵـە دەرچـوو!.} زانـای بـەناوبانگی بیرکـاری (باسـکاڵ) ووتەیـەکی بەناوبانگی لەم بارەیـەوە هەیـە کـە دەڵێـت: {ڕوخساری مرۆڤایـەتی هـەر هەمووی گۆڕا بەهۆی لووتی (کیلۆ باترا)، بەڵام دوای نزیکەی دوو هـەزار

**ساڵ ڕێرەوی مێژوو دووبارە گۆڕایەوە بەهۆی لووتێکی تر کە ئەویش لووتی (داروین) بوو!.}**

بەڵام لە کۆتاییدا (فەتز ڕۆی) بە هەرحاڵێك بێت، ڕێگەی پێدا کە بەشدار بێت لە گەشتەکە. پێی ووت ئەگەر لەبەر خاتری باوکە دیندارەکەت نەبووایە هەرگیز ڕێگەم پێ نەدەدایت!. داروین بۆی ڕەخساو چانسی بەشدار بوونی ئەم گەشتەی وەرگرت، چەند ساتێکی کەم بەر لە دەست پێکردنی گەشتەکە، داروین نامەیەکی بۆ (سوزان) ی خوشکی ناردو ووتی:- **(کاپتن فەتزڕۆی هەردەم بە زیادە ڕۆیی باس لە دەریاکە دەکات، وە من ئەگەر چووم بۆ گەشتەکە، دەتوانم بگەڕێمەوە بۆ ئینگلترا ئەگەر ویستم. هەروەها ئەگەر گەیشتین بە هەر وڵاتێکی خۆش و جوان دەتوانم لەوێدا بمێنمەوە!، هەموو پێداویستیەکانیشم بۆ دەستەبەر دەبێ و دڵنیام کارەکان بە چاکی دەڕوات بەڕێوە، بۆیە بە هیوای دیدار خوشکی ئازیزم....)**. لە ٢٧ی دیسەمبەری ساڵی ١٨٣١ز کەشتی بێگڵ دەستی کرد بە جوولە بۆ ڕۆیشتن و سووڕانەوە لە نێو دەریاو زەریاکانداو دابەزین لە ناوچە زانستییەکاندا. ئەم کەشتیە داروین و زۆرێك لە زانایانی بوارە هەمە جۆرەکانی هەڵگرتبوو. بەڵام نازانم نهێنی چییە لەوەدا کە گەشتێکی وا ناوداری زانستی بەهۆی کەشتیەکی جەنگی ئەنجام بدرێت بەجۆرێك کە ناوی گەشتیەکە (بێگل) تەنها گوزارشت لە جەنگ و دەستگیر کردن دەکات، چونکە ووشەی (بێگڵ) لە زمانی ئینگلیزی دا واتە (سەگی ڕاو)!. لەم گەشتەدا پیلانیان وابوو کەنارەکانی ئەمەریکای باشور ببڕن و پێوانەیەکی زەمەنی بۆ جیهان دروست بکەن. داروین لە ماوەی ئەم گەشتەدا دوو شتی گەورەی بەسەر داهات یەکێکیان ئەوە بوو کە

فکرەی دارشتنی تیۆری پەرەسەندنی بە مێشك داهات، دووەمیشیان، تووش بوونی بە نەخۆشییەکی درێژ خایەن لە گەشتەکەدا. لە سەرەتادا گەشتەکە خەریك بوو سەرنەگرێ و کۆتایی پێ بێت چونکە هەر لەگەڵ دەست پێکردنیدا، کەشتیەکە کەوتە بەر هێرشی ڕووداوگەلێکی دەریایی مەترسیداری وەکو ڕەشەبای توندو بەرز بوونەوەی شەپۆلەکان، بە جۆرێك ئەم ڕووداوە داروینی وا تۆقاندبوو کە لە یەکێك لە یادەوەرییەکانی دا بلێت:- (دەریا وەکو چیا بەرز دەبووەوەو شەپۆلەکان بە یەکیان دادەداو کەشتیەکە کەوتبووە بارێکی مەترسیدار، لە شەویشدا ترس ئەوەندە هەرەسی بۆ هێنایین کە هەرگیز لە ژیانم دا شتی وام نەدیبوو. ڕەشەبا لە هەموو لایەك هەڵی دەکردو دەریا شەپۆلی دەهاویشت و بانگ و هاواری کەشتیوان و ئەفسەرەکان لە هەموو لایەك بەرز دەبوەوە. لە ناو ئەو هەموو دەنگە سامناکانەدا شتێکی وا دروست بوو کە هەرگیز لە یاد ناکرێ ). لە سەدە کۆنەکاندا ئەگەر کەشتی لە ناو دەریادا بکەوتبایە بارێکی ترسناك، کاپتن و سەرنشینانی کەشتیەکە یەکێکیان فڕێ دەدایە ناو ئاوەکە، چونکە لایان وابوو کە تاوانی ئەو کەسەیە دەریای تووڕە کردووە!، باشە ئەگەر کاپتن (فەتزرۆی) باوەڕی بەم شتە هەبوایە، دەبوایە کێی بدابا بە دەریاکە؟ بێگومان ئەو کاتەش لووتی داروینی دەگرت و دەیووت تۆ بڕۆ بە کەڵکی هیچ نایەیت!. بە هەرجۆرێك بێت گەشتەکە بەردەوام بوو چونکە دواتر بارەکە هێمن بویەوە و کەشتیەکە هاوسەنگی و ئارامی بەخۆیەوە بینی. ئەم گەشتەی داروین گەورەترین گۆڕانکاری خستە ناو ژیانی و لێکۆڵینەوەکانی، چونکە ئەو زانست و بوارانەی کە گەشتەکەی بۆ ئەنجام درابوو سەد لەسەد بە دڵی داروین بوو.

پێشتر داروین لە دوو زانکۆدا شکستی هێنا چونکە بوارە زانستیەکانی لاپەسند نەبوو بەڵام ئەمجارە زۆر بە دڵیەتی کە دەبینێت سەرنشینانی ناو ئەم کەشتیە تەنها بایەخ بە زانستەکانی ئاژەڵان و سروشت و ژیان و ڕووداوە جیۆلۆجیەکان دەدەن. بەم جۆرە دەتوانین بڵێین سەر پشتی ئەم کەشتیە بۆ داروین بووە ناودارترین زانکۆی زانستی کە داروین دەرچووی ئەم زانکۆیە بوو، هەر لەم زانکۆیەدا بڕوانامەی بیردۆزی پەرەسەندنی هەڵگرت!. داروین لە ژێر کاریگەری دیمەنە سروشتیە سەرسوڕهێنەرەکانی ئەم گەشتەدا دەڵێت (**لەم گەشتەمدا شتی زۆر سەیرو سەمەرەم بینی، ئەم گەشتە سەرەتای دەست پێکردنی قۆناغی دووەمی ژیانم بوو!**). داروین لە سەر پشتی کەشتیەکە تا ڕادەیەك هۆکارەکانی لێکۆڵینەوەو دیراسەی بۆ دەستەبەر ببوو. لە کاتی گەشتەکەیدا خەریکی لێکۆڵینەوە بوو لەبارەی ئەو کۆمەڵە ڕووەکانەی کە لەسەر ڕووی ئاوەکەدا دەژیان و بڕێکی زۆریشی لە ئەنجامەکان و زانیارییەکان لای خۆی تۆمار دەکرد. بەڵام لەبەر نەبوونی شارەزاییەکی زۆر لە بواری توێکاری (تشریح) و وێنە کێشانی نموونەکانی گیانداران، لەم ڕووانەوە شتێکی وای دەست نەکەوت کە شیاوی باس کردن بێت. لە دوای تێپەڕ بوونی سێ حەفتە بەسەر گەشتەکەدا، سەر نشینەکان لە بەندەری (**سان یاگۆ**) دابەزین کە ناوچەیەکی وابوو دیاردە جیۆلۆجیەکانی وەکو بڕکان و لێك ترازانی زەوی بەچڕی تێدا دەبینرا. داروین لەم گەشتەیدا مێشکی خۆی کردەوە بۆ زانینی بەڵگەو زانیاریەکانی پەیوەست بە ژیان و سروشت، لەو کاتەی لە کەنارەکانی ئەمەریکای باشوردا دەسووڕانەوە تێبینی ئەوەی دەکرد کە هەشت پێ (**أخطبوط**) کە گیانداڕێکی ئاوییە ڕەنگی خۆی دەگۆڕێ لە ناو

ئاودا. هەروەها لـە نێـو ووشکانیەکاندا ئێسك و پروسـکی قـەبارە گـەورەی بـەدی دەکـرد کـە بـە جـددی هـەولی دەدا بـۆ دۆزینـەوەی چـەند پەیوەندییەك لە نێوان ئەم ئێسکانەو گیاندارە زینـدووەکانی ئێسـتا، بـەڵام دانیشتوانی ئەم ناوچانە جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ئەم ئێسکانە لە کاتی زیندوویێتی گیاندارەکان وا گەورە نەبوون بەڵکو لـە دوای مردنیـان ئێسکەکان قەبارەیان گەورە بـووە. هـەروەها خـەڵکی ناوچـەکە دەیـان ووت ڕووبارەکانی ئەم ناوچەیە توانای گەورەکردنی ئێسکیان هەیە لـە قـەبارەی بچووکەوە بۆ قەبارەی گەورە. داروین زۆر گرنگی بـە ئاژەڵـە نامۆکـان دەدا کە لە بارێکی ژیانی قورس و سەخت دا دەژیان، کاتێـك سـەیری ئـەو بۆقـە بچـووکانەی دەکـرد کـە ڕەنگـی سـکیان قـورمزی بـوو نـاوی دەنـان بـۆقی شەیتانی، چونکە باوەڕی وابوو ئەو جۆرە بۆقانە کە لە خاکـە لمـاوییەکانـدا دەژین لە ژێر تیشکی بەهێزی خـۆر توانـای مەلـەکردنیان نییـە.. داروین چاوی لە سەر هیچ شتێك لا نەدەبرد کە چاوی دەکەوتە سەر، تەنانەت بە دیققەتــەوە ســەیری دارمــان و درز بردنـــی بــەردەکان و شــەق بــوون و تێکچـوونەکانی چـیاکانی ئەنـدێز و جێمـاوەی بوومەلـەرزەکانی دەکـردو دەیـووت گـۆی زەوی لــە گـۆڕان دایــە بــەهۆی کـارتێکرانی بــە هۆکـارە جوولێنــەرەکان، دواتــر کـاپتن (فـەتزرۆی) ڕووی کەشـتیەکەی ئاراسـتەی دورگـەی (جالاپـاجوس) کـرد کـە ٦٠٠ میـل لـە کـەنارەکانی ئەمـەریکای باشـورەوە دوورە. ئـەم دورگەیـە لـە کۆنـدا دورگەیـەکی برکانـاوی بـووە و داگیرسـاوەتەوە، برکانــەکان و پاشماوەکانیــان و ئاسـن و کـانزا تواوەکـانی ناوی، مایەی تێڕامانی داروین بوو. داروین دەڵێت ئەم دورگەیە جیهـانێکی بچـووك بـوو لـە گیانـداری هەمـەجۆری وا کـە لـە هـیچ شـوێنێکی تـردا

گیانداری وا بوونیان نەبوو. کیسەڵی درعداری هەمە جۆری تێدا دەژیا و باڵندەکانی ئەو دورگەیە هیچ ترسێکی مرۆڤیان لەسەر نەبوو. هەروەها داروین لەم دورگەیەدا زۆر سەرسام ببوو بە شێوازە ژیانییەکانی جۆرە چۆلەکەیەك کە دواتر ناو نران بە (**چۆلەکەی داروین**) _**عصافیر داروین** — داروین پێشتر لە زانکۆدا زۆر ڕقی لە زانستی زەوی ناسی (**جیۆلۆجیا**) بوو بەڵام لەم گەشتەیدا بە پلە یەك گرنگی بە زانستی جیۆلۆجیا دەدا، زۆر گرنگی بە دیاردەو ڕووداوە جیۆلۆجیەکان دەدا بە تایبەت کە داروین یەکێك بوو لە لایەنگرانی زانای زەوی ناس (**شارلس لایل**) کە بیردۆزێکی هەبوو دەیووت پێکهاتە جیۆلۆجیەکەی گۆی زەوی هەردەم لە پەرەسەندن دایە، (شارلس لایل) زانایەکی زەوی ناس (**جیۆلۆجیست**) بوو کە کتێبێکی ناوداری هەبوو لەم بوارەدا بەناوی (**بنەماکانی جیۆلۆجیا**) کە بانگەشەی گۆڕان و پەرەسەندنی بەردەوامی دەکرد لە پێکهاتە جیۆلۆجیەکەی گۆی زەوی. داروین یەکێك بوو لە لایەنگرانی ئەم بیردۆزە چونکە ئەو دیاردەو گۆڕانکارییە جیۆلۆجییانەی کە لە ئەمەریکای باشوردا بینی، بە ڕای ئەو، بەڵگەی بەرچاون بۆ ڕاستی ئەم بیردۆزە... (شارلس لایل) گەورەترین پاڵپشت و هاندەری داروین بوو کە هەر لە سەرەتاوە تاوەکو دارشتن و بڵاوکردنەوەی بیردۆزی پەرەسەندن پاڵپشتی و ڕێنماییەکانی ئەو، تاکە سەرچاوەی بەرزکردنەوەی وورەو توانا دەروونیەکانی داروین بوو. ڕێنماییە پەروەردەییەکانی (هنسلۆ) لەگەڵ ئەو دیاردە جیۆلۆجیانەی کە لەم گەشتەدا بینی وایان لە داروین کرد کە زۆر سەرسام و خولیای زانستی زەوی ناسی بێت، تەنانەت وای لێهاتبوو کە زانایانی تری هان دەدا بۆ

چوونە نـاو ئـەم بـوارە، هـەروەك لـە نامەكەیـدا دیـارە كـە بـۆ هاورێكـەی (د.فۆكس) نووسی و تێیدا ووتی:-

**(زانستی جیۆلۆجیا لە گشت لقەكانی زانستی سروشتناسیدا مەیدانێكی كراوەیـە بـۆ فـراوان بـوونی دیـدو هۆشـی مـرۆڤ. جیۆلۆجیـا زانسـتێكی بنچینەیی و سەرەكییە بەو هۆیـەی كـە مـرۆڤ بـە ئاسـانی تێـی دەگـات و خوێندنـەوەو بیركردنـەوەی كـەمی دەوێـت...)** بـەم جـۆرە داروین پـاش بەسـەر بردنـی پێـنج سـاڵی تەمـەنی بـە گەشـتێكی زانسـتی بـە دەوری كـەنارەكانی ئەمـەریكای باشـور لـە سـەر كەشـتی (بێگڵ) ی بـەریتانی، لـە ساڵی ١٨٣٦ز گەڕایەوە بۆ ووڵاتی خۆی. ئەم گەشـتە بـۆ داروین گـەورەترین سەرچاوەی كۆكردنـەوەی زانیـاری گـرنگ و ڕاسـتیەكانی ژیـانی گیانـداران بوو. بڕێكی زۆری لە جۆرە جیاوازەكانی ڕووەك و ئاژەڵ و پاشماوە بەبەرد بووەكانی كۆكردەوە. شایانی باسە داروین هەتا كۆتایی هاتنی گەشتەكەشی باوەڕی وا نەبوو كە گیانداران لە گۆڕان و پەرەسەندن دابن، بەڵكو بـاوەڕی بە نەگۆڕی و جێگیری گیانداران هەبوو، بەڵام لە دوای گەشتەكە لـەم ڕایـە پاشـگەز بوویـەوە و بانگەشـەی گـۆڕان و پەرەسـەندنی جۆرەكـانی دەكـرد. هـەروەك لـە نامەیەكیـدا كـە بـۆ یـەكێك لـە دكتۆرەكـانی هـاوڕێی نووسـی دەڵێت:- **(كاتێك من لـە گەشـت دابـووم لەسـەر كەشـتی بێگڵ، بـاوەڕم بـە گۆڕانی جۆرەكانی گیانداران نەبوو. بەڵام پاش گەڕانەوەم لە ساڵی ١٨٣٦ ز بیروڕام گۆڕاو هەوڵی كۆكردنەوەی بەڵگەو زانیاریم دا تاوەكو پەرەسەندن و گۆڕانی گیانداران بسەلمێنم.)** هەروەها داروین بە جەستەیەكی نـەخۆش و ناسـاغ لـە گەشـتەكە گەڕایـەوە كـە ئـەم نەخۆشـییە درێـژ خایەنـەی تـا كۆتـایی ژیـانی بـۆ مـاوەی چـل سـاڵ هـەر لەگـەڵ مایـەوە. بـەڵام داروین

ســەرەڕای بــێ هێــز بــوونی و نــەخۆش کــەوتنی جەســتەکەی، هــەرگیز دەرفەتی نـەدا بـە خـۆی کـە بوەسـتێ لـە لێکۆڵینـەوە و نووسـین لـە بـارەی سروشـت و ژیـان. لـەدوای بڵاوکردنـەوەی بیروڕاکـانی تیۆرەکـەی، سـەرەتا پیلانی دارشـتبوو کـە کتێبێـك بنووسـێت بـۆ وەڵام دانـەوە و ڕازی کردنـی ڕەخنەگرانی بیردۆزەکەی، بەڵام کاتێك داروین بینی زۆرێـك لـە زانایـان و نـاودارانی ئـەو سـەردەمە بـەرگری لـە بیردۆزەکـەی دەکـەن و بوونەتـە لایەنگرو پاڵپشت بۆ بیروڕاکانی، ئـیتر پێویسـتی نـەکرد ئەمـە بنووسـێت و لـە جیـاتی ئەمـە هەڵسـا بـە دارشـتنی کتـێبی (دابـەزینی مـرۆڤ) کـە بـۆ یەکـەمجار لـەم کتێبـەدا بانگەشـەی مـەیموونێتی مرۆڤـی کـردو سـەرەتای دەرکەوتن و دروست بوونی مرۆڤی لەم کتێبەدا باس کرد. هەروەها کتـێبی (کرمی زەوی) یەکێکە لەو کتێبانـەی کـە داروین لـە قۆناغـە کۆتاییـەکانی تەمـەنی دا نووسـیویەتی، لەگـەڵ ئەمانەشـدا چـەندین کورتـە بابـەت و نامەی زانستی بە تۆمار کراوی لـە دوای خـۆی جێهێشت. داروین لـە دوای گەڕانەوەی لە گەشتەکەی و دوای سێ ساڵ لە ساڵی ١٨٣٩ ز ژنی هێناو کچی مامی خۆی (ئێمما) ی مارە کرد، لوتف و سۆزی هاوسەرگیری تـا ڕاددەیـەك ئـارام کـەرەوە بـوو بـۆ دەروونـە شـێواو و نەخۆشـەکەی داروین. هـەروەها زیاتر لە حەوت منالی هـەبوو کـە یـەکێك لـە کوڕەکانی بـووە نووسـەرێکی ناودار لە دوای باوکی. ئەمانەش ناوی پێنج لە منالەکانیەتی:-

١. ولیەم کە ئەمەیان یەکەم منالی بوو لە ساڵی ١٩١٤ کۆچی دوایی کرد.

٢. ئانە ئێلیزا بیث.

٣. ماری ئێلینور.

٤. هێنری ئێما.

٥. جۆرج هاوارد.

داروین زۆر کارتێکراو بوو بە بیروڕاو نووسراوەکانی زانای فەرەنسی (لامارك) کە بەر لە داروین بانگەشەی گۆڕان و پەرەسەندنی جۆرەکانی گیاندارانی دەکرد. لامارك هاو تەمەنی باوکی داروین بوو کە هەردووکیان یەك ڕایان هەبوو لە سەر چۆنیەتی پەرەسەندن و گۆڕانی گیانداران لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر... بەم جۆرە دەبینین کە زانستی پەرەسەندن لەو سەردەمەدا بە دەوری ئەو ژینگەیەدا خولاوەتەوە کە داروینی تێدا ژیاوە بێگومان ئەمەش کاریگەرییەکی بە هێزی لەسەر دەروونی داروینیدا هەبوو تاوەکو بێتە ناو جیهانی لێکۆڵینەوە زانستی یەکان.

زۆر لە کۆنەوە خەڵکی، بە تایبەتی زانایان خەریکی زانین و دۆزینەوەی سەرەتای ژیان بوون کە هەر یەکەو بە جۆرێك لێکدانەوەیەکی بۆ سەرەتای ژیان دادەنا. ئایینەکان بە هێزترین فاکتەر بوون بۆ خستنە ڕووی ڕاستیەکانی سەرهەڵدانی ژیان لەسەر زەوی، لەگەڵ سەرهەڵدانی ئایینە ئاسمانیەکان سەرەتا و بنچینەی دروست بوونی ژیانی سەر زەوی بۆ دەسەڵاتی خوا گەڕێنرایەوە، بەڵام لە سەدە کۆنەکاندا خەڵك بە پێی بیروڕای خۆیان سەرەتای پەیدا بوونی ژیانیان دیاری دەکرد، لە کۆنەوە وا باو بووە کە مرۆڤ و گیانداران لە جۆرێکەوە گۆڕاون بۆ جۆرێکی تر بە هۆی کاریگەری ژینگە، بۆ نموونە وا باو بووە کە مرۆڤ لە ئەنجامی پەرەسەندن و گۆڕانی مەیموونە هۆشیارەکانی وەکو غۆرێللا و شەمبازی پەیدابووە!، پێشتریش ئەم مەیموونانە لە گیانداری ترەوە دروست بوون، بەم جۆرە گشت گیانداران لە یەکترییەوە دروست بوون. وەك ئەوەی چۆلەکە ببێتە کەلەشێرو مشك ببێتە مامز و مێش ببێتە گامێش...!

(شـارلس داروین) ی زانـای سروشـتناس لـە سـەدەی نـۆزدەدا هـات و ئـەم بیروڕا خورافیانەی خستە نێو چوارچێوەیەکی زانستی و بـەرگێکی زانستی لەبەر کردو بە بەڵگەی جۆراوجۆر بیردۆزەکەی خۆی لە سەر ئەو بنەمایە دامەزراند... بەم جۆرە دەتوانین بڵێین بیردۆزەکەی داروین " تـەنها بـە زانستی کردنی خورافیاتەکانە".....

داروین لە ژیان دا ٧٣ ساڵ ژیا، کە تا نیوەی تەمەنی بە تەندروستیەکی ساغ و جەستەیەکی بە هێز ژیانی دەگوزەراند، بەڵام لە کاتی گەشتەکەیدا لەسـەر کەشتی بیگل لەساڵی ١٨٣٤ ز دا، تێکچوونێکی سـەیر لـە جەستەی ڕوویداو بووە هۆی ئـەوەی کـە داروین تـاکو مـردن، ژیانی بـە نەخۆشی و ئازار بباتە سـەر. ئـەم ناساغییە کاریگەرییـەکی گـەورەی لەسـەر کارەکانی داروین هەبوو، بەتایبەتی لە کاتی گەورە بوونی تەمـەنی بـە درێـژایی ڕۆژ گیرۆدەی ئازارو ئێش و بێزاری دەبوو، تەنانەت جاری وا هـەبوو بـۆ مـاوەی مانگێك زیاتر بە بەردەوامی لـە ئـازاردا دەژیـا. تـا وای لێهات لێکۆڵینـەوەو بیرکردنـەوەی زانستیشی لاواز بـوو، بـەڵام خـۆڕاگری و بـەردەوامی لەسـەر کارەکانی بووە هۆی درێژەدان بە کارو داهێنانی تـری زانسـتی وەکـو کتـێبی (دابـەزینی مـرۆڤ) و چـەندان بابـەتی تـری زانسـتی کـە لـە ڕۆژنامـەو گۆڤارەکانـدا بڵـاوی دەکـردەوە... بـەناو بـانگترین بەرهـەم و نووسـراوی داروین بریتییە لە کتێبی زانستی نـاودار (أصـل الأنـواع) کە گشت بـیروڕاو بەڵگـەکانی خـۆی تێـدا کۆکردۆتـەوە لـە بـارەی گـۆڕان و پەرەسـەندنی گیانداران. داروین لەم کتێبەیدا سەرجەم توانا زانستیەکانی خستۆتە گەڕ بۆ ئەوەی بسەلمێنێت کە مرۆڤ و گشت گیاندارانی تر لـە یـەك سەرچاوەوە دروست بوون و سەر بە یەك خێزانن. گەورەترین بنەما کە لە کتێبەکەدا

جێگەی سەرەکی پێدراوە بریتییە لە ( هەڵبژاردنی سروشتی)، سروشت لە نەزەری داروین ئەو هێزەیە کە هەڵدەستێت بە کوشتن و لەناو بردنی ئەو گیاندارانەی کە بۆ ژیان گونجاو نین و ئەوانەش کە بە هێزو گونجاون بۆ ژیان سروشت هەڵیان دەبژێرێت بۆ مانەوەیان لە ژیان، ئەو هێزەشی ناو ناوە بە هەڵبژاردنی سروشتی. داروین ئەم کتێبەی لە ساڵی ١٨٥٩ز دا بڵاو کردەوەو ئێستا وەرگێڕراوەتە سەر زۆربەی زمانە جیهانییەکان و لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی زۆری لەسەر کراوە لە لایەن زۆرێك لە زاناو نووسەرە ناودارەکانی جیهان...

لە سەرەتاکانی ساڵی ١٨٨٢ز باری تەندروستی داروین بەرەو خراپی ڕۆیشت و بە تەواوی کەوتە ژێر ڕکێفی نەخۆشیەکەی و هیوای ژیانی کەم بوو، تاوەکو لە ١٩ی ئەپرێلی ساڵی ١٨٨٢ز هەڵبژاردنی سروشتی هیچ شەفاعەتی بۆی پێ نەکراو گیانی لە دەست دا، بە ناچاری ئەو ژیانەی تەسلیم کرد کە هەردەم بە دوای دۆزینەوەی سەرەتاکەی دا دەگەڕا. لە ٢٤ی ئەو مانگە لاشەکەی لە گۆڕستانی (سمنستر) نێژرا لە تەنیشت هەریەك لە زانای بەناوبانگ (ئیسحاق نیوتن) و (ولیەم هێرتشل)، هەروەها لە ساڵی ١٨٨٥ز پەیکەرێکی بۆ دروستکرا لەسەر داوای زۆرێك لە لایەنگرانی بیردۆزەکەی.

# بەشی چوارەم

## سەرەتای دەرکەوتنی بیردۆزەکەی داروین و کتێبی بنچینەی جۆرەکان

داروین لە پاش گەڕانەوەی لە گەشتەکەی لە ساڵی ١٨٣٦ز هەوڵەکانی چڕتر کردەوە بۆ سەلماندنی پەرەسەندن و گۆڕانی گیانداران لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر، گشت جۆرە لە یەك چووەکانی گیاندارانی بەراورد دەکردو هەردەم خەریکی بەڵگە کۆکردنەوە بوو بۆ دامەزراندنی بیردۆزەکەی. لەو ماوەیەدا داروین بیردۆزەکەی بە تەواوی دامەزراندو بنەماکانی بە تەواوی بۆ دارشت و هەموو بیروڕاکانی خۆی لە کتێبێکدا کۆکردەوە بەناوی (أصل الأنواع). بەڵام با ئەوەش بزانین کە داروین ئەم بیردۆزەی لە داهێنانی خۆیەوە نەبوو، بەڵکو چەندین ساڵ پێش ئەو، بەردی بناغەی ئەم بیردۆزە دانرابوو لە لایەن پۆلێك زاناو فەیلەسووفانی یۆنانی و عەرەبی و ئەوروپی بەر لەوەی بەناوی داروین بکرێت. داروین لە لایەن باوك و باپیرییەوە ڕێگەی بۆ خۆش کرا تاوەکو بگاتە لووتکەی داهێنانی ئەم بیردۆزە.. (ئەراسمۆس) ی باوکی داروین لەگەڵ (لامارك) ی سروشتناسی فەرەنسی باوەڕیان وابوو کە گیانداران بە پێی پێویستیان و گونجانیان لەگەڵ ژینگە ئەندامەکانی لەشیان دەگۆڕێ. بۆ نموونە لامارك

دەیووت مراوی بۆیە پەنجەکانی پێی نووساون بە یەکەوەو گۆڕاون بۆ ئـەم شێوەیە، چونکە مراوی بەردەوام لەناو ئاودا مەلەی کـردووەو بەمـەش وای پێویست کردووە کە پەنجەکانی بەم چەشنە بێت بۆ مەلە کردن. هـەروەها لامارك ڕای وابوو کـە (زەڕافـە) لـە کۆنـدا مـامز بـووەو گۆڕاوە بـۆ زەڕافـە! دەیووت لە کۆندا کاتێك مامزەکان دەمیـان بـەرز کردۆتـەوە بـۆ خـواردنی گـەڵای دارە بـەرزەکان بـەرە بـەرە ملیـان درێـژ بـووە تـاوەکو بگەنـە گـەڵا بەرزەکان و لەگەڵ ژینگەکەیان بگونجێن. بەم جۆرە سیفاتی درێژی مل لە ڕێگەی بۆماوە گوازراوەتەوە بۆ نەوەکانی و جـۆرێکی نـوێ واتـە زەڕافـە لـە مـامز دروسـت بـووە. هـەروەها بـاپیری دارویـن بـە هاوبەشـی لەگـەڵ زانـای فەرەنسی (بۆفۆن) بیردۆزێکیان دانا کە دەیانووت زینـدەوەران بـە گـوێرەی ڕاهاتنیـان لەگـەڵ ژینگـە سـیفاتی نوێیـان لـێ پەیـدا دەبێـت و لـە ڕێگـەی بۆماوەشـەوە دەگوازرێتـەوە بـۆ نـەوەکان. داروـن هاوسـەردەمی زۆرێـك لـە زانایـانی سروشتناسـی بـوو کـە سـەرجەمیان باوەڕیـان بـە گـۆڕان و پەرەسـەندنی زینـدەوەران هـەبوو. زانـای ڕووەکنـاس (هنسلۆ)، هـەروەها زەوی ناسی بەناوبانگ (شارلس لایل) باوەڕیان وابـوو نـەك تـەنها ڕووەك و گیانداران لە پەرەسەندن دان، بەڵکو دەیـانووت هەسـارەکان و پێکهاتـەکانی گـۆی زەوی هـەردەم لـە گـۆڕان دان، بـەم جـۆرە داروـن لـە جیهانێکـدا دەرکەوت کە فکرەی پەرەسەندن سەراپای ئەو جیهانەی داگرتبوو ئەمـەش کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر داروین تاوەکو تـەواو کردنـی ڕێبـازی زاناکانی پێش خۆی بگرێتە ئەستۆی خـۆی. داروـن وەك ئـەوەی بڵێـی کـە ئەو زانستەی بە بۆماوە دەست کـەوتبێ دەبیـنین بیردۆزەکـەی بـە تـەواوی کاریگـەری زاناکـانی پـێش خـۆی تێـدا دەبینـرێ بـە تایبـەتی بیروڕاکـانی

(لامارك). بەڵام با بپرسین ئایا داروین بۆچی بۆتـە پاڵـەوان و داهێنـەری یەکـەمی بـیردۆزی پەرەسـەندن و بـە پێشـەوای ئـەم بـیردۆزە ناسـراوە لـە کاتێکدا بنـەماو بیروراکـانی ئـەم بـیرۆزە چـەندین ساڵ پـێش هـاتنی ئـەو، ئاشکراو روون بوون؟ وەڵامی ئـەو پرسیارە ئەوەیـە کـە کاتێـك بـۆ مـاوەی چـەندین سـەدە بـیرو بۆچـوون و بەڵگـەکانی پەیوەسـت بـە پەرەسـەندن لەسـەر یـەکتر کەڵەکـە ببـوون و تـەنها لێکۆڵینـەوەی سـەرەتایی و قسـەی سەرزارەکی بوون، وا پێویست بوو کە لە عەقڵێکی گشتگیردا کۆبکرێنـەوەو بیرو باوەرەکان بخرێنە سەر یـەك و بابەتەکە بکرێتـە بیردۆزێکـی زانستی سەلێنراوو بە رەسمی ببێتە لقێك لـە لقـەکانی زانسـتی سروشتناسـی. بـەم جۆرە داروین هات و ئەم بیروڕایانەی کۆکردەوەو بەڵگەی زانستی دانە پاڵ و چـوار بناغـەی سـەرەکی بـۆ بینـای بیردۆزەکـەی دارشـت ئـەوانیش **(ململانێـی مانــەوەو هەڵبــژاردنی سروشــتی و بۆمــاوەو خۆگونجانــدنی ژینگەیی)** بوون. بیرورا کەڵەکە بووە کۆنەکانی پەیوەست بـە پەرەسـەندن پێویسـتی بـە کەسـێك بـوو کـە پـەردەی لەسـەر لابـدات و هـەمووی لـە کتێبێکـدا کۆبکاتـەوەو بیکاتـە بیردۆزێکـی زانسـتی، بێگومـان داروین ئـەو کەسـە بـوو کە هەستا بـە گـۆرینی ئـەم بـیرو رایانـە بـۆ بیردۆزێکـی وا کـە هەموو ئـەم بۆچوونانە لـەخۆ بگرێت، هـەر لەبـەر ئـەم هۆیەشـە کـە لـەو کاتەوە داروین بە رابەرو دانەری بیردۆزی پەرەسـەندن دادەنـرێ. هـەروەها ئـەو زەمەنـەی کـە داروینـی تێـدا دەژیـا سـەردەمێکی زۆر گونجـاو بـوو بـۆ داروین بۆ داهێنانی شتێکی لەم جۆرە، چونکە لەو کاتـەدا زۆربـەی زاناکـان خـەریکی لێکۆڵینــەوەی بابەتــە سروشــتییەکان بــوون و هــەوڵی زانــینی بنچـینەی ژیانیـان دەدا. هـەروەها گەشـتە بەناوبانگـە زانسـتییەکەی سـەر

کەشتی بێگڵ کە لە سەردەمی گەنجێتی داروینیدا ئەنجام دراو داروین خۆیشی لەم گەشتە سوود بەخشەدا بەشدار بوو. بەم جۆرە لە گشت لایەك بەخت یاوەری بوو تاوەکو ببێتە پاڵەوان و ئەفسانەی داستانی پەرەسەندن. داروین لە پاش گەڕانەوەی لە گەشتە زانستیەکەی، بیردۆزەکەی خۆی تەواو کردو بیروڕاکانی لە کتێبێکدا کۆکردەوە بەڵام بۆ ماوەی ٢٣ ساڵ یەك ووشەی لە بیردۆزەکەی بڵاو نەکردەوە. ئەو بێدەنگییەی داروین وای لە دۆستەکانی کردبوو کە بیر لە شتی هەمەجۆر بکەنەوە. هەندێکیان دەیانووت ڕەنگە هێشتا هەر خەریکی کۆکردنەوەی بەڵگە زانستییەکان بێت، هەندێکی تر دەیانووت ڕەفتارەکەی کاپتن (فەتزرۆی) وای لێکردووە کە سارد بێتەوە لە کارەکەی. بەڵام لە ڕاستیدا ئەمانە هیچی وا نەبوو، بەڵکو داروین لەوە دەترسا کە هێرشی توندی پڕ لە ڕەخنەو نارەزایی ڕووی تێ بکات. بۆ ماوەی ٢٣ ساڵ بیروڕاکانی هەر بە نهێنی هێشتەوە و تەنها لە لای چەند دۆستێکی نزیکی باسی کردبوو وەکو شارلس لایل و جۆزیف هوکر. داروین دەیزانی کە بەم بیردۆزە هەست و شعوری زاناکان و ئایینزانەکان و خەڵکە ئاساییەکە بە توندی بریندار دەکات و لەوە دەترسا کە تیۆرەکەی ببێتە مایەی هێرشێکی توندو سەختی فکری و ئایدۆلۆجی کە خراپ بە سەریدا دەشکایەوە، تەنانەت داروین وای بڕیار دابوو کە بیردۆزەکەی پاش مردنی خۆی لە لایەن خێزانەکەیەوە بڵاو بکرێتەوە! ئەمەش ئەوپەڕی ترسانە لە ڕەخنەو نارەزایی و هەڵسانی ڕقی خەڵك. هەروەها بڕیاری دابوو کە کتێبێکی تایبەت بنووسێت بۆ وەڵام دانەوەی ڕەخنەو نارەزاییەکان... لە بەهاری ساڵی ١٨٥٦ز دا (شارلس لایل) داروینی ئاگادارکردەوە کە چیتر بێدەنگی

پیشـان نـەدات و ئەنجامـەکانی ئاشـکرا بکـات. لەنامەیەکـدا پێـی ووت (وا **باشـترە ئەنجامـەکانت ئاشـکرا بکـەیت، ئەگـەر نـا یـەکێکی تـر پـێش تـۆ دەیکات)!.** داروین سەرەتا پەیمانی دا کە بیردۆزەکەی ئاشکرا بکات بـەڵام جارێکی تر نەوێراو دوای خست. ئەم دواخستنەی داروین تا کۆتاییـەکانی ژیانی بەردەوام بوو بەڵام ئەو پێشبینی یەی کە (شارلس لایل) کردبـووی کە ووتبووی کەسێکی تر پێش تۆ دەیکات، سـەد لـە سـەد ڕاست دەرچوو. لـەو ماوەیـەدا داروین هـەواڵێکی ترسـناکی بیست ئـەویش ئـەوە بـوو کـە گـەنجێکی سروشـتناس بـەناوی (ئەلفرێـد راسـل والاس) خەریکـە پـێش داروین بـیردۆزی پەرمسـەندن تـەواو بکـات و بڵـاوی بکاتـەوە. ئـەو گەنجـە هەسـتابوو بـە گەشـتێك بـەناو ئەندۆنیسیا کە هەرچی شێوازێکی ژیـانی بەرچاو کەوتبایـە کـۆی دەکـردەوە، (والاس) خـەریك بـوو بگاتـە لووتکـەی ئەو بـیردۆزەی کـە دەیـەها ساڵە داروین ژیـانی بـۆ تـەرخان کـردووە. ئـەم هەواڵە زۆر کوشندە و سامناك بوو بۆ داروین، چونکە تاکە هیـواو ئـاواتی ئەوە بوو کە ببێتە ناودارێکی مێژوویی بە هۆی بیردۆزەکەیـەوە کەچی وا خەریکە (والاس) بەر لە ئەو، شەرەفی نازناوەکە بەدەست بهێنێت! داروین کەوتـە دوو دڵی و بـارێکی نـاڕێکی دەروونـی بەسـەر داهات. سـەرەتا بـیری لەوە کردەوە کە بەتەواوی لەم مەیدانەدا بکشێتەوەو نازناوی ئەم بوارە بۆ (والاس) لێگـەڕێ. تەنانـەت لـەو کاتـەدا ووتـی ( **وا چـاکترە کتێبەکـەم بسوتێنم)!** ئێستا ئەگـەر ئێمـە ئـەم هەڵوێستەی داروین شـی بکەینـەوە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە داروین خۆیشی دەیزانی کە بیردۆزەکەی ئـەو، هـیچ خزمـەتێك بـە مرۆڤایـەتی ناکـات بـەڵکو تـەنها بـۆ پەیـدا کردنـی ناوبانگ بووە چونکە ئەگەر بیردۆزەکە خزمەتێك بوایەو هـەروەها ئەگـەر

داروینــیش خــۆی بــە خزمــەتکاری مرۆڤایــەتی لــە قەلــەم دابایــە ئــەوا نەیدەگوت کتێبەکەم دەسوتێنم و تیۆرەکەم لەناو دەبەم، بەڵکو دەبوایە بە شانازییەوە لەگەڵ (والاس) ئەم خزمەتەیان بکردایە بەڵام شاردنەوەی بیردۆزێـك بـۆ مـاوەی ٢٣ سـاڵ و ئـەم شـڵەژانەی داروین بـەهۆی گـەنجێك بەڵگـەی بەرچاون لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەم بـیردۆزە هـەرگیز بـۆ خزمـەت دانـەهێنراوە. بـەڵام داروین بـەر لـەوەی هـیچ کارێـك بکـات چـوو بـۆلای هەردوو دۆستەکەی (شارلس لایل) و (جوزیف هوکر) تاوەکو ڕاوێـژیان پـێ بکـات. ئـەو دوو زانایـە بـە درێـژایی ئـەو بیسـت سـاڵە ئاگـاداری هـەوڵ و کۆششــەکانی داروین بــوون بــۆ ســەلماندن و دامەزرانــدنی بــیردۆزی پەرەســەندن. دوو دۆســتەکەی پێشــنیاری ئــەومیان بـۆ کـرد کـە خولاسـەو سـەرەنجامەکانی بیردۆزەکـەی کـورت بکاتـەوەو وەکـو پوختەیـەکی زانسـتی پێشکەشـی بکـات بـە کۆمەڵـەی زانسـتی لـینی. لـە سـاڵی ١٨٥٨ز (ئەلفرێـد والاس) نامەیـەکی بۆ داروین نـاردو تیایـدا پوختـەی بیروڕا زانستیەکانی خـۆی لـە بـارەی پەرەسـەندن دەرخستبوو. داروین لەسـەر پێشـنیاری دوو دۆســتەکەی، پوختــەی بیردۆزەکــەی خــۆی لــە کۆمەڵــەی زانســتی لــینی خوێندەوە لەگەڵ ئـەو نامەیـەی کـە والاس بـۆی نـاردبوو، لـەم پوختەیـەدا داروین بە ڕوونی باسی دروست بـوونی جـۆری نـوێ و بـەردەوامی گـۆڕانی گیانداران بە هـۆی هەڵبـژاردنی سروشـتی کردبـوو. لـەم کورتەیەیدا گشـت ئــەو بنــەماو ئەنجامانــەی خســتە ڕوو کــە بــە درێــژایی ئــەو بیســت ســاڵە گومانی لە ڕاستیان نەبووە و لە ناخـەوە بـە ڕاسـتەقینەی زانسـتی دانـاون. سەرەنجام و بیروڕا زانستیەکانی داروین بە ماوەی ساڵێك لـە لایـەن داروین خۆیــەوە کۆکرایــەوەو لــە نۆفەمبــەری ســاڵی ١٨٥٩ز چـاپکرا بـەناوی (أصـل

الأنـواع)، کـە مەبەسـت و ئامانجـە سـەرەکیەکەی نـاوەرۆکی کتێبەکـە وەکـو ناونیشانێك خرایە سەر بەرگی کتێبەکە کە ئەم ڕستەیە بـوو: (بنچینەی جۆرەکان و پەرەسەندنیان بە هۆی هەڵبژاردنی سروشتی و مانەوەی ئـەو جۆرانەی کە لە ململانێی مانەوەدا سەردەکەون). لەمەوە بـۆ یەکـەم جـار کتێبی بنچینەی جۆرەکان و بیردۆزی پەرەسەندن بە ناوی داروینـەوە بڵاو بوویـەوە کـە ئـەوەش خـەونی چـەندین سـاڵەی ئـەو بـوو، ئـەم کتێبـە لـە سەرەتای بڵاو بوونەوەیدا جوولانەوەیەکی فکری گەورەی پەیـدا کـردو زۆر لـە پیـاوانی زانسـت لـەو کاتـەدا دژایـەتی ئـەم تیۆرەیـان دەکـردو تەنانـەت زاناکـانی بـایۆلۆجی لـە تاقیگەکانـدا هـەوڵی پووچـەڵ کردنـەوەی بـیرو بـۆ چـوونەکانیان دەدا بـــە بەڵگـــەی پراکتیکـــی. هـــەروەها پیـــاوانی ئـــایینی دژایەتیەکی توندی ئەم بیردۆزە نوێیـەیان دەکـرد. بیروڕاکـانی ئـەم کتێبـە شتێکی نوێ و داهێنـراو بوو بۆ ئەو کاتە، چونکە مەسەلەی دروست بـوونی بوونەوەرو مرۆڤی دەبەستایەوە بـە سـەرەتایەکی سادەو فکرێکـی فەلسـەفی وەك ئـەوەی بڵێـی کـە داروین کاریگـەر بـووبێ بـە بیروباوەڕەکـانی ئـایینی هێندوسـی و بـوزی کـە تیۆرەکـەی ئـەو، هـیچ دەسـتێکی باڵا بـە پێویسـت نازانێت بۆ دروست بوونی بوونەوەر. هەروەها ئەم کتێبـە تێگەیشـتنی زۆر قورس بوو بـە جۆرێـك کـەم کـەس توانـای ئـەوەی هـەبوو بـە ڕوونـی تێـی بگات، هەروەك (تۆمـاس هکسلی) کـە یـەکێك بـوو لـە لایـەنگرە دیارەکـانی داروین لەو کاتەدا ووتی:

**کتێبی بنچینەی جۆرەکان قورسترین کتێبە بۆ تێگەیشتن!**

کتێبەکە لە پازدە بەش پێکهاتووە و داروین بەشـی حەوتـەمی نـاو نـاوە بە (کێشە و ئاستەنگەکانی ئەم بیردۆزە)، لەم بەشەدا داروین بـە ڕاشـکاوی

دان بە هەندێك كەم و كوڕی و بێ توانـایی بیردۆزەكـەی دەنێت لـە ئاست هەنـدێك لـە مەسـەلەكان. گـەورەترین بابـەت كـە زەبـری كوشـندەی لـە بیردۆزەكـەی داروین داوە كـە لـەم بەشـەدا دانـی پیـا دەنێـت مەسـەلەی هـەبوونی غـەریزە زیـرەك و هۆشـیارەكانە لـە گیاندارانـدا بـە تایبـەتی هـەنگ. ئـەم كتێبـە لـە هەنـدێ بـیرو بۆچـوون دا بـە تـەواوی نـوقمی نـاو هەڵـەی گـەورە ببـوو كـە هـیچ كـەس بـۆی نـەدەكرا ئینكـاری لـێ بكـات. لەناوەرۆكی كتێبەكەدا باسی ڕێكەوت (الصدفة) كراوە كە داروین پێی وایە ڕوودانـی هـەر گۆڕانێـك و دروسـت بـوونی هـەر جـۆرێكی نـوێ بـەهۆی ڕێكەوت دەبێـت. بێگومـان فكـرەی ڕێكـەوت لـە هـیچ عـەقلێكی زانستی دا جێگەی نابێتەوە و لەسەر تـەرازووی مەنتیقـدا هـیچ كێشی نییـە چونكە گومان لەوەدا نییـە كـە هـیچ شـتێك ناگۆڕێـت و ناجوولێـت و كـار ناكـات و ناچێت بەڕێوە تاوەكو سـەبەب و هێزێـك كـاری تـێ نـەكات. ئەگـەر وابێـت ئـەی بۆچـی گیانـدارە بـە بـەردبووەكانی نێـو چـینەكانی زەوی بـەهۆی سودفەو ڕێكەوت گیانیان بۆ ناگەڕێتەوەو نابنەوە گیانداری جاران؟ بۆچی لە دیدگای داروینیـزم دا ڕێكـەوت دەتوانێـت گیانـدارێك دروسـت بكـات كـە تەنانـەت ئێسـك و پروسكیشـی وجـودی نـەبووەو هـەر نـەبینراوە بـەڵام ناتوانێت ژیان بداتەوە بە گیاندارێك كە ئێسكە پەیكەری ئامادەیە لـە نێـو چـینەكانی زەوی دا؟. ئەمـە وەك ئـەوە وایـە كەسـێك لـەناو جەرگـەی بیابـانێكی ووشـكدا بـە بـێ بـوونی هـیچ كەرسـتەو دارو بزمـاری پێویسـت، بڵێت من كەشتیەك دروست دەكەم، بـەڵام لەسـەر لێـواری دەریـا نـەتوانێت پارچــە تێكشــكاوەكانی كەشــتیەك پێكــەوە ببەســتێتەوەو بیكاتــەوە كەشـتیەكەی جـاران! داروین لـە كتێبەكەیـدا زۆر بـە ڕوونـی دان بـەوەدا

دەنێت کە ڕێکەوت (صدفة) شتێکە نیشانەی ڕاستی پێوە دیار نییـە، بـەڵام ئەم فکرەیەی لە کتێبەکەیدا لانەداوە، بێگومان ئەمـە بـۆ شـاردنەوەی کـەم و کوڕییەکی گەورەی بیردۆزەکەیەتی هەروەك داروین دەڵێت: **(لە هەندێك شوێندا باسی ئەوەم کردووە کە گۆڕانکارییەکان بەهۆی ڕێکەوت ڕوویانداوە بـەڵام ئـەم لێکدانەوەیـە زۆر دوورە لـە ڕاسـتی، بـەڵکو لەبـەر ئـەوە باسـم کردووە تاوەکو جێگەی ئەو هۆکـارو پاڵنـەرە بگرێتـەوە کـە لـە لای ئێمـە نادیارەو هۆکاری سەرەکی گۆڕان و پەرەسەندنەکانە!** ). بەم جۆرە داروین دەیزانی کە بیردۆزەکەی ئەو ڕووبـەڕووی گـەورەترین کێشـە دەبێتـەوە کـە ئەویش فکرەی هەبوونی خودایە، داروین هەستی بەو پرسیارە کردووە کـە دەڵێت ئەو هێـزە کێیـە کـە گۆڕانکـاری بەسـەر گیانـداران دێنێـت و جۆری نوێ دروست دەکات؟ بـۆ وەڵـامی ئـەو پرسـیارە (ڕێکـەوت) ی دانـاوە بـەڵام گومـان لـەوەدا نییـە کـە ڕێکـەوت هێـز نییـە بـەڵکو ئـەویش پێویسـتی بـە هێزێك هەیە تاوەکو کار لە شتەکان بکات و ڕێك بکەوێت. بێگومان ئەگـەر داروین لـە جیـاتی ڕێکـەوت باسـی هێـزی خـودای کردبایـە وەکـو هێزێکـی کاریگـەرو دروسـتکار، ئـەوا پشـتگیری و پاڵپشـتی گشـت پیـاوانی ئـایینی بەدەست دەهێنـا بـۆ تیۆرەکـەی بـەڵام ئینکـاری داروین بـۆ ئایینـەکان وای لێکـرد کـە ڕێکەوتی کوێرانـە بـە هێـزی ئـەودیوی سروشت وەسـف بکـات. داروین دەڵێت ئـەو هێـزەی کـە شـتەکان دروسـت دەکـات نادیـارە لای ئێمـە بۆیە (ڕێکەوت)م لـە جیـاتی دانـاوە! لـەم قسـەیەدا دەردەکـەوێ کـە داروین کاتێـك بـە چـاو سـەیری ئـەو هـەموو نەخشەسـازی و ڕێـك و پێـك کارییـە ناوازەو نایابەی بوونەوەرانی دەکرد بۆی دەردەکەوت کە مەحاڵەو هـەرگیز ناکرێ ئەم جیهانە بەبێ خودایەکی کاربەجێ و زانا هەڵبسوڕێ و هاتبێتـە

کایەوە. بەڵام لە پێناو دانەڕمانی بیردۆزە خەیاڵیەکەی دڵی خۆی لە ئاست هەبوونی خوادا کوێر کردو ﴿فإنها لا تعمى الأبصار ولكن تعمى القلوب التي في الصدور﴾!. واتە بە ڕاستی چاوەکان کوێر نابن، بەڵکو ئەوە ئەو دڵانەن کوێر دەبن کە لە نێو سنگەکان دان.. بەڵام هەر چۆنێك بێت کتێبەکەی داروین ناوبانگێکی باشی پەیدا کردو کەوتە بەردەستی زۆرێك لە زانایان و بیرمەندانی ئەو کاتە، داروین لە سەرەتادا باسی مرۆڤی نەکرد لە کتێبەکەی لە ترسی هەڵسانی ڕق و کینەی خەڵکی، بەڵام پاش ئەوەی کە کۆمەڵێك لە زانا هاوسەردەمەکانی خۆی بوونە لایەنگرو بەرگری کاری بیردۆزەکەی، داروین لێکۆڵینەوەیەکی بڵاو کردەوە بە ناوی (دابەزینی مرۆڤ) کە تیایدا بە درێژی باسی پەرەسەندنی مرۆڤ و دابەزینی لە پایەی کۆتایی گیانداریێتی دەکرد. داروین بە شەرم و ترسەوە لە ساڵی ١٨٥٩ز بیردۆزەکەی خۆی ئاشکرا کرد، بەڵام ئەوەی کە ڕوویدا بە تەواوی پێچەوانەی ترس و دڵەڕاوکێی ئەو دەرکەوت، چونکە زۆر لە زانایانی ئەو کاتە بوونە لایەنگری و بەرگرییان لە بیرو بۆچوونەکانی کردو کتێبەکەی دەنگدانەوەیەکی خێرای بە خۆیەوە بینی. (تۆماس هکسلی) لە کاتی ناسینی تیۆرەکەی داروینـدا ئەوەنـدە پێی سەرسام ببوو بە جۆرێك کە ووتی {**ئێمە چەندە نەزان و گەوج بووین کە پێش ئێستا هەرگیز بیرمان لە شتی وا نەکردبووەوە!**}. هەروەها(جوزیف هوکر) بووە پشتیوان و پاڵپشتی سەرەکی ئەم تیۆرەو زانای زەوی ناس (شارلس لایل) هەردەم لە هەوڵی سەلماندنی بیروڕاکانی داروینـدا بوو بۆ بڵاوکردنەوەیان. هەروەها (ئەلفرێد والاس) ئەو کەسەی کە خەریك بوو بەر لە داروین ئەم تیۆرە بڵاو بکاتەوە بووە لایەنگرێکی بەرچاوی داروین و بەناوی داروینەوە

بیردۆزەکەی نـاو دەهێنـا. ئـەم دۆسـتانەی داروین لـە کـاتی وەڵام دانـەوەی رەخنەکاندا وەکو ووتار خوێن و زمـان حـاڵی ڕێبـازو بەرنامەیـەکی پیرۆز دەردەکـەوتن کـە تـا ڕاددەیـەکی بـاش تـرس و دڵەڕاوکێی داروین نـەما لـە ناخیدا بەهۆی ئـەم دڵسۆزانەیەوە. داروین شێوازێکی ئەومنـدە فریـودەرو هـەڵ خەڵەتێنـەری بـەکار هێنـابوو بـە جۆرێـك دەگێڕنـەوە کـە (سـتالین) سـەرەتا کەسـێکی دینـدار بـوو بـەڵام لـە دوای خوێندنـەوەی کتێبەکـەی داروین، بـووە دوژمـنی سەرسـەختی ئـایین و ئینکـاری هـەبوونی خـودای دەکرد.... زانای ڕووەکناسی بـەناوبانگ (واتسۆن) لـە دوای بڵاو بوونـەوەی کتێبەکەی داروین، نامەیـەکی بـۆ نـاردو ووتـی: (بیرورا سـەرەکیەکانت لـە داهاتوودا وەکو ڕاستییەکی زانستی دانـی پیـا دەنـرێ، هـەروەها فکـرەی هەڵبژاردنی سروشتی نیشانەی ڕاستیە سروشتییەکانی تیا بەدی دەکـرێ، چونکە بابەتە ئاڵۆزو نادیارەکان ڕوون دەکاتەوە، بە ڕاستی تۆ گەورەترین شۆڕشـگێڕی لـە جیهانـدا! ). (مـارکس) ی ڕابـەری ڕێبـازی ماددیـەت و سـەرمایەداری لـەو کاتـەدا سەرسـامی خـۆی نیشـاندا بەرامبـەر بـیرورا ماددیـەکانی داروین و هـەروەها فەیلەسـووفی ئیلحادی (نیتچە) نووسـەری کتـێبی نـاوداری جیهـانی (زەردەشـت ئاوەهـای گـوت) یـەکێك بـوو لـە باوەڕدارەکانی مەزهەبەکەی داروین و کارتێکراو ببوو بـە فکـرەی ململانـێ لە پێناو مانەوە. ئەفکارە ماددیەکانی داروین گەورەترین کاریگەری لەسەر دەروونی (هیتلەر) دا هـەبوو تـاوەکو دڕندەیـەکی لـەم جۆرەی لـێ دروست بێـت. بـەم جـۆرە بـەهۆی پشـتیوانی دۆسـتەکانی،داروین تـوانی نەخشـەو پانتـایی بیردۆزەکـەی فـراوان بکـات و تەنانـەت ئێسـتا لـە ناوچـەکانی ڕۆژهەڵاتیش دا لایـەنگرانی داروین هـەوڵی بـە زانستی کردنـی بیردۆزەکە

دەدەن. بەڵام با ئەوەش بزانین کە لەم قۆناغانەدا سێ پرۆفیسۆری ناوداری جیهانی دەرکەوتن و هەڵسان بە ڕماندن و ڕووخاندنی بیردۆزەکەی داروین لە بناغەیەوە کە ئەوانیش **(لویس پاستۆر)** و **(کریس مۆریسۆن)** و **(هارون یحیی)** بوون. (لویس پاستۆر) ی زانای بایۆلۆجی فەرەنسی گوشندەترین زەبری لە بیردۆزەکەی داروین دا کاتێك لە تاقیگەدا بە بەڵگەی عەمەلی سەلماندی کە ژیان هەرگیز لە خۆیەوە لە ماددەی نازیندوو دروست نابێت بە ڕێکەوت. (لویس پاستۆر) سەلماندی کە هەر زیندەوەرێك لە دایك و باوکێکی جۆری خۆی نەبێت دروست نابێت. تاقی کردنەوەکانی (لویس پاستۆر) ئەوەندە مەترسیدار بوون لەسەر بیردۆزەکەی داروین تەنانەت لایەنگرانی داروین هەڵدەستان بە دووبارە کردنەوەی تاقی کردنەوەکانی بۆ ئەوەی ئەنجامەکانی بشێوێنن بەڵام هەر دەگەیشتنەوە هەمان ئەنجام. هەروەها پرۆفیسۆری ناودار (کریس مۆریسۆن) بیروڕاکانی داروینی هاویشتە ناو زبڵدانی زانست کاتێك هەڵسا بە نووسینی کتێبی **(العلم یدعو للإیمان)** کە ئەم کتێبە یەکێکە لە نووسراوە ناودارەکانی جیهان کە لە دژی داروین و تیۆرەکەی نووسرابێت. (کریس مۆریسۆن) هەڵسا لە دژی کتێبەکەی (تۆماس هکسلی) کەناوی ئەمە بوو (مرۆڤ بە تەنیا هەڵدەستێتەوە ) کتێبێکی نووسی بە ناوی (مرۆڤ بە تەنیا هەڵناستێتەوە)- **الإنسان لا یقوم وحدهُ**- (کریس مۆریسۆن) لەم دوو کتێبەیدا یەك ووشەی زانستی بۆ بیردۆزەکەی داروین ناهێڵێتەوە کە بۆنی ڕاستی لێ بێت.

پرۆفیسۆرو نووسەری ناوداری تورکی (هارون یحیی) کە نووسەرێکی ناوداری جیهانی ئیسلامییەو هەوڵی دەدا کە بە بەڵگەی زانستی، هێزو

توانای خوا بسەلمێنێت. (هارون یحیی) بەوە ناسراوە کە نووسینەکانی زەبرێکی سەخت و ترسناکە بۆ بیردۆزەکەی داروین و هەر کەسێك کتێبەکانی ئەو بخوێنێتەوە هەرگیز فکرمیەکی ماددی و ئیلحادی لە مێشکی دا نامێنێت. (هارون یحیی) تەنها بە بەلگەی (خانەو گەردی دی ئێن ئەی) بناغەی بیردۆزەکەی داروین دەهەژێنێت و جێگەی پێ لەق دەکات. کتێبی (السلوك الواعي لدي الخلية) و کتێبیی (خدعة التطور) بریتین لە دوو کتێبی ناوداری جیهانی کە (هارون یحیی) نووسیویەتی و بیردۆزەکەی داروین لە ئاست ئەم دوو کتێبەدا چۆك بە ئەرز دادەدات. نووسراوەکانی (هارون یحیی) مۆرکێکی ئیسلامی پێوە دیارەو بە دەقی ئیسلامی و بەلگەی زانستی شەڕی ئەم تیۆرە دەکات. (هارون یحیی) ئەوەندە کاریگەر بوو لە پووچەلّ کردنەوەی ئەم بیردۆزەی داروین تەنانەت لە هەندێك ڕۆژنامەو گۆڤارە زانستیەکانی ئەوروپادا، قسەی لەسەر دەکراو هۆشداری ئەومیان دەدا کە لە ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا بیردۆزی پەرەسەندن بەهۆی نووسینەکانی (هارون یحیی) هیچ بایەخی نەماوە! هەروەها لە سەردەمی ئێستادا سەرجەم لقەکانی زانستی خانەزانی و بۆماوەزانی و زیندەوەرزانی و تۆماری بەبەردبووەکان تیری کوشندەی وا ئاراستەی ئەم بیردۆزە دەکەن بەجۆرێك کە جەستەی ئەم بیردۆزە لە گشت لایەك تیری ڕەخنەی بەرکەوتووەو خوێنی لەبەر دەڕوات و برین پێچانی ئەم تیۆرەش لە جیهاندا هەوڵی تیمارکردنی برینە بێ چارەسەرەکانی دەدەن...

# بەشی پێنجەم

## ناوەرۆکی بیردۆزی پەرەسەندن و چوار کۆڵەگە ئەفسووناوییەکەی

پەرەسەندن و گۆڕان هزرێکی هەڵقوڵاوی نێو بیرو ناخی کۆمەڵگا هەرە کۆنەکانی وەکو یۆنانییە فەلسەفە ناسەکان و بگرە چاخە دێرینترەکانیشە، پەرەسەندن لەم چاخە کۆنانەدا تەنها چەند لێکدانەوەیەکی سادە بوو کە لە ئەنجامی هەندێ بیرکردنەوەی لاوەکی بە بیری مرۆڤ دا دەهات، لەیەکچوونی گیانداران لە ڕووی ئەندامەکانی جەستەو نزیکییان لە یەکتری لە شێوەی هەڵکەوتنی لاشەییەوە، وای لە هەندێك سروشتناسان کردبوو کە بڵێن سەرجەم گیانداران لە یەکتریەوە دروست بوون قۆناغ بە قۆناغ بە تێپەڕبوونی کات و بە هۆی هۆکارو کارتیاکەرە ژینگەییەکان و لە ژێر قامچی خواوەندی سروشت کە ئەم سروشتە هەندێکی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی درێژە بە کاروانی ژیان بدەن و هەندێکی تریشی ناچارکردووە کە بەرەو چاڵی مەرگ لێژ ببنەوە،.. لە کۆنترین و دێرینترین زەمەندا یەکەم خاڵ کە بیردۆزی پەرەسەندن لێیەوە دەستی بە دەرچوون کردو یەکەم پاڵنەر کە بووە هۆی سەرهەڵدانی ئەم فکرەیە لەیەکچوونی هەندێ سیفاتی جەستەیی و

غەریزی بوو لە نێوان مرۆڤ و مەیموون و هەندێ جۆری تری گیاندار، کەواتە ئەم بیردۆزە هەر لە یەکەم چرکە ساتی سەرهەڵدانییەوە پێگەیەکی زانستی نەبووە کە پشتی پێ ببەستێ بەڵکو تەنها متمانەی کردۆتە سەر هێزی خەیاڵ و شی کردنەوەی چەند دیاردەیەکی ڕووالەتی،.. لەیەکچوونی نێوان دووشت هەرگیز بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە ئەم دووانە لە یەکترییەوە دروست بوون، بەپێی هیچ پێوەرو یاسایەك ناتوانرێ بووتری کە مرۆڤ و مەیموون لە یەك سەرچاوەوە دروست بوون بەهۆی چەند لێکچوونێکی دوورو نزیکی لاشەیی و غەریزی، بێگومان بانگەشە کردن بۆ بیروڕایەکی لەم جۆرە، هیچی کەمتر نییە لەو گەوجایەتیەی کە کەسێك بێت و بڵێت پایەکانی قادرمە لەبەر ئەوەی یەك لە دوای یەك دێن و لە یەك دەچن بۆیە لە یەکتریەوە دروست بوون!.. فکرەی پەرەسەندن کاتێك کە بەسەر زاری فەیلەسوفە یۆنانییەکان و بیریارە عەرەبەکاندا دەهات تەنها چەند عەقیدەیەکی فەلسەفی بوو کە بە هۆی بینینی دیمەنە ڕووالەتییەکان هەستیان بەرەو لای ئەم فکرەیە دەچوو بەڵام لە سەدەی هەژدەو نۆزدەدا لە ئەوروپا چەند فەیلەسووفێکی ئیلحادی دەستیان خستە ناو دەستی یەکترو بە چەکی فکرەی پەرەسەندن دەستیان کرد بە فریودانی عەقلی مرۆڤە ساکارەکان و ئیعلانی شەڕی ئایین و فکرەی هەبوونی خوایان کرد،.. فەیلە سووفانی سەدەی نۆزدە لە ئەوروپادا ئەم فکرە فەلسەفییەیان قۆستەوە تاوەکو وەڵامێکی زۆر بێ شەرمانە ئامادە بکەن بۆ وەڵام دانەوەو بەرەنگار بوونەوەی ئەو پرسیارەی کە لە دێر زەمانەوە، بەڵکو هەر لە سەرەتای دەرکەوتنی مرۆڤایەتییەوە ئاراستەی عەقڵی نەوەکانی ئادەم کراوە کە

هەردەم دەپرسێت و دەڵێت ﴿الست بربکم؟﴾ !... ئەو بیردۆزەی کە لە سەردەمێکدا تەنها پێشنیار و گریمان بوو، لە سەدەی نۆزدەدا بە رابەرایەتی (شارلس داروین) ی ئینگلیزی کرایە بیردۆزێکی ڕەسمی و وەکو ڕاستییەکی زانستی بەسەر ناخ و بیری خەڵکانی ئەوروپادا سەپێنرا، داروین تەنها نەبوو لە داهێنانی بیردۆزی پەرەسەندن و نووسینەوەی ئەفسانەکانی، بەڵکو لەو کاتەدا چەندەها فەیلەسووف هاوسەردەمی خۆی زۆر بە پەرۆشییەوە بە دەوری فکرەیەکی لەم جۆرەدا دەخولانەوە لە پێناو ئەوەی کە هەریەکەیان بۆ خۆی هەڵسێت بە پەرەپێدانی ئەو ئایدۆلۆجیا ماددییە کوێرانەی کە دەیانویست بەسەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا بیان سەپێنن، هەر بۆیە کاتێك داروین هەڵسا بە دارِشتن و بڵاو کردنەوەی بیردۆزی پەرەسەندن هەر لە یەکەم ساتدا سەرجەم فەیلەسووفە ماددە بازەکانی ئەو سەردەمە لایەنگرێتی خۆیان بۆ داروین و تیۆرە تازەکەی نیشان دا، چونکە ئەم بیردۆزە گەورەترین و بە هێزترین فاکتەری ڕەش کردنەوەی خوا بوو لە مێشکی مرۆڤەکان کە بە شێوەیەکی زانستی و ئایدۆلۆجی هەوڵی دەدا بسەلمێنێت کە خوا بوونی نییەو ئەم گەونە پێویستی بە هیچ خوایەك نییە بۆ دروست بوونی، ڕێبازە ماددییە فەلسەفییەکان و عەقیدە و مەنهەجە داهێنراوەکانی وەکو مارکسیەت و عەلمانیەت و سەهیۆنیەت و چەندەها فکرەی تری ئیلحادی لەم جۆرە، هەرگیز بۆیان نەدەگونجا کە بیرو ڕاکانیان بسەپێنن تاوەکو عەقیدەی هەبوونی خوا لە عەقلی مرۆڤ دەرنەهێنن، بەڵام داروین بەهۆی ئەم بیردۆزەوە گەورەترین بناغەی بۆ ئەو ئایدۆلۆجیا ئیلحادییانە دارِشت کاتێك گوتی: (سروشت هەرچی بیەوێت دروستی دەکات و هیچ

**سنورێکیش بۆ هێزو تواناکەی نی یە!)..** داروین وای برِیاردا کە ژینگەو کاریگەرییەکانی وەکو خاك و ئاوو تیشکی خۆرو ساردی و گەرمی و چەندەها هۆکاری تری ژینگەیی لەم جۆرە بوونەتە هۆی گەشەکردنی تەنێکی ماددی و ئەم تەنە گۆڕاوە بۆ ماددەیەکی ئەندامی و دواتر پەرەی سەندووە تاکو سەرجەم گیانەوەران و مرۆڤەکان قۆناغ بەقۆناغ هەریەکەیان لە جۆری پێش خۆی دروست بووە تاوەکو گەیشتۆتە مرۆڤ کەواتە بە پێی ئەم بیردۆزە رەچەڵەکی مرۆڤ دەچێتەوە سەر تەنۆچکەیەکی ماددی مردوو کە ئەم تەنۆچکەیەش لە ژێر کاریگەری کارتیاکەرە ژینگەییکان گەشەی کردووەو ژیانی وەبەر هاتووە! هەروەها بیردۆزەکەی داروین بانگەشەی ئەوە دەکات کە مردن و ژیان برِیارێکە بە دەست سروشتەوە، لە ناوەرۆکی بیردۆزەکەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە سروشت تەنها خواوەندێکە کە مەرگ و ژینی بەدەستەوەیە، داروین رای وایە کە ئەو گیاندارانەی لاوازو بێ هێزن و توانای پاراستنی جۆرەکەی خۆیانیان نییە، سروشت دەیانکوژێ و بنەبریان دەکات و ئەوانەش کە تواناداروبەهێزن سروشت هەڵیان دەبژێرێت بۆ ئەوەی لە ژیان دا بمێنن و ئەو هێزە ئەفسووناویەشی ناو ناوە بە **(هەڵبژاردنی سروشتی)**.. هەروەها وای دانا کە ئەو هەموو نەخشەسازی و ئاڵۆزییە ناوازەیەی بوونەوەر تەنها بەهۆی هەڵکەوتن و رێکەوتەوە دروست بوون و بەم شێوەیە هەڵکەوتوون، دوای ئەم بیروباوەرِو فکرانەی داروین، ئیدی هیچ رۆڵێك بۆ دەسەڵاتی خوایی نامێنێتەوە چونکە ئەگەر وابێت کە بوونەوەرو مرۆڤ بەهۆی هۆکارە ژینگەییەکانەوە دروست بووبن و هەڵبژاردنی سروشتیش مردن و ژیانی بەدەست بێت و هەرچی

نەخشەسازی و سەیرو سەمەرەی کەون و گەردوون هەیە بەهۆی (ڕێکەوت (الصدفة)) هاتبێتە کایەوە، ئیتر لێرەدا دەورو ڕۆلی خوا نامێنێت و ڕەنگە بووترێ خوا هەر بوونی نییە کە ئەمە گەورەترین مەبەست و ئامانجی فەیلەسووفە ماددیەکانی سەدەی نۆزدە بوو...

ڕێکەوت ((الصدفة)) ئەو خواوەندە خولقێنراوە بێ هەست و نەستەیە کە سەرجەم زانا ماددییەکان لە بیردۆزەکانیاندا وەکو کارای دروستکارو خالقی بوونەوەران سەیریان کردووەو وەکو پاساوێکی ساختە لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەدا بەکاریان هێناوە کە هەردەم ڕووبەڕوویان دەبێتەوە و لێیان دەپرسێت کە ئایا ئەو نەخشەسازییە ناوازەیەو هاوسەنگی یە بێ وێنەیەی کە لە دروستکراوەکاندا دەردەکەوێت لە ژێر دەستی کێ دا بەم جۆرە هەڵکەوتووە؟ مرۆڤ کاتێك دەڕوانێتە ئەو هەموو دروستکراوەی دەوروبەری خۆی و بیر لەو یاساو ڕێکخستنە نایابە دەکاتەوە کە بە گوێرەی گونجانی ژیان ڕەخسێنراوە، ئەوەی بە خەیاڵ دادێت کە ئەم بوونەوەرە بەبێ خالق و دروستکارێك هیچ بەهاو مانایەکی نییە، چونکە جێ دەستی یەکێك دیارە لەم ڕێك و پێکییەدا.. بیردۆزی پەرەسەندن کاتێك بیر لە سەرەتای دروستبوونی زیندەوەران دەکاتەوە دەڵێت یەکەم زیندەوەر لە ژینگەیەکی ئەندامیدا بە ڕێکەوت دروست بووەو ئەم زیندەوەرە بەرە بەرەو بە تێپەڕینی ڕۆژگار، گەشەی کردووەو گۆڕاوە تا گەیشتۆتە سەردەمی دروست بوونی مەیموون و مرۆڤ ئەم تیۆرەی داروین بەپێی دان پیانانەکانی زۆربەی لایەنگرەکانی، هیچ بنەمایەکی ڕاستی و زانستی نییە، بەڵام تەنها لەبەر ئەوە پشتیوانی لێ دەکەن چونکە ئەم بیردۆزە تاکە چەکێکە بە دەستیانەوە بۆ ئەوەی شەڕی

دیـن و خواپەرسـتی پـێ بکـەن هـەروەك دەبیـنین کـە (ئارسـەر کیـت) ی لایەنگری دەمارگیری داروینیەت بـە ڕاشکاوی پەردە لەسـەر ئـەم ڕاسـتییە لادەدات و لە دان پیانانێکدا دەڵێت:- (**بیردۆزی پەرەسەندن تا ئێستا هیچ بەڵگەو دەلیلێکی ڕاستی نییەو هەرواش دەمێنێتەوە، بەڵام لەبەر ئەوە ئێمە بڕوامان پێی هەیەو پاڵپشتی دەکەین، چونکە ئەگەر ڕەتی بکەینەوە، ئەوە بە ناچاری دەبێت ئیمان بەوە بهێنین کە خوا بوونەوەرانی خەلق کردووە!**).. لەو کاتەی کە گەردووناسان دەریان خست کـە خۆرو کۆمەڵـە هەسارەکەی و سەرجەم ئەستێرەکانی تـر، لـە پێشدا یـەك پارچـە بـوون و بـەهۆی تەقینەومیـەکی گـەردوونی لـە یـەکتری جیابوونەوەتـەوە کـە پێـی دەووتری (بیگ بانگ) واتە (تەقینـەوەی گـەورە)، شـتێکی سـەیر سـەرنجی هەموو لایەکی ڕاکێشا، ئەویش ئەوەبوو کە بۆچی لەم تەقینەوەیـەدا زەوی و سـەرجەم هەسـارەکان وا بـەڕێك و پێکـی و هەریەکـەیان لـە شـوێنی گونجـاوی خـۆی هەڵکـەوت بـە قەبارەیـەکی پێوانـەیی نـاوازە؟ ئەمـە لـە کاتێکـدا کـە گومـان لـەوەدا نییـە هـەموو تەقینەوەیـەك کاولکـاری و لـەناوبردنی هەرەمـەکی و تێکدانی بەدواوەیە! گۆی زەوی ئەگـەر چـەند مەودایەکی تر لە خۆر نزیکتر بوایە، ئەوە بێگومـان گـڕی دەگـرت و ژیـانی لەسەر نەدەبوو، یـاخود ئەگـەر چـەند مەودایـەك لـە خـۆر دوورتـر بوایـە، ئەو کاتەش لەبەر ساردێتی دەیبەستاو دووبـارە ژیـانی لەسـەر نـەدەما، جا ئایـا بـەهۆی تەقینەوەکـە زەوی کەوتـە ئـەم شـوێنەی خـۆی لەکاتێکدا کـە هـەموو تەقینەوەیـەك هەرەمەکییـەو کاولکـاری لـە دواوەیـە؟ یـاخود بـا سەیری قەبارەی گۆی زەوی بکەین، قەبارەی زەوی بە شێوازێکی وا ڕێـك و پێوانـەیی هەڵکـەوتووە بـەجۆرێك ئەگـەر قەبارەکـەی تۆزێـك گـەورەتر

بووایە، ئەوە هێزی کێش کردنی زەوی ئەوەندە بەهێز دەبوو کە سەرجەم گازە ژەهراوییەکانی نێو بۆشایی گەردوونی بۆ لای خۆی ڕادەکێشاو ژیان هەرگیز لەسەر زەوی دروست نەدەبوو، یاخود ئەگەر قەبارەکەی تۆزێك بچووکتر بووایە لەم قەبارەیەی کە بۆی دانراوە، ئەوە هێزی کێش کردنی زەوی زۆر لاوازو کەم دەبوو بەجۆرێك کە زەوی نەیدەتوانی ئەو ئۆکسجینەی کە لە سەریەتی ڕای بگرێت و ئەو کاتەش ژیان هەرگیز نەدەبوو،، جا ئایا ئەمە دەبێت چ تەقینەوەیەك بێت کە پاشماوەی ئاوا سەیرو ڕێك و پێك بەدوای خۆیدا جێ بهێڵێت لە کاتێکدا کە گشت تەقینەوەیەك کاولکاری بە دواوەیە!؟. بێگومان دەبێت ئەم تەقینەوەیە سەرپەرشتی کراو بێت لەلایەن خالقێکی زۆر تواناداراەوە کە بە ویستی ئەو ڕوویدابێت و ئەو ئەندازە سەیرەی لە دوای خۆی جێ هێشتبێت کە تاوەکو ئێستا مرۆڤ نەیتوانیوە لە برێکی کەم لە نهێنییەکانی بگات ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ﴾. واتە (ئایا بێ بڕواکان نابینن کە لە پێشدا ئاسمانەکان و زەوی تۆپەڵێك بوون و ئێمە لە یەکتریمان جیا کردنەوە؟) داروین لە کتێبەکەیدا زۆر بە ڕاشکاوی بیروڕاکانی پەرەسەندن باس دەکات و بنەماکانی تیۆرەکەی تا ڕاددەیەکی باش ڕوون و بەرچاوە، لەسەر بەرگی کتێبەکەیدا نووسراوێك دەبینین کە بە شێوەیەکی گشتی گوزارشت لە پوختەی بیروراکانی پەرەسەندن دەکات کە ئەویش بریتی یە لە **(بنچینەی جۆرەکان و پەرەسەندنیان بەهۆی هەڵبژاردنی سروشتی و مانەوەی ئەو جۆرانەی کە لە ململانێی مانەوەدا سەردەکەون)**. ئێستا ئەگەر بمانەوێت دەقی باس و بابەتەکانی کتێبەکەی داروین پوخت بکەینەوە، بۆ ئەوەی بە کورتی لە باسە هەرە سەرەکییەکان

بگــەین، ئــەوا لــە کــاتی خوێندنــەوەمان بــۆ تیۆرەکــەی داروینــن، ئــەم خولاسەیەمان دەست دەکەوێت کە بیردۆزەکە دەڵێت:-

(لە سەرەتای دروست بوونی هەسارەکان و گەردوون گۆی زەوی دا، ژیان هەرگیز بوونی نەبوو، ڕووەك و گیانداران و باڵداران و مـرۆڤ و هەرچـی گیان و جووڵەی هەبێت وجودیـان نـەبوو، پاشـان خانەیـەك یـان تـەنێکی ئەندامی وورده وورده لە ژینگەیەکی ماددی گونجاودا واتە لە (ژێر خاك)، دەسـتی بـە گەشـەکردن کـرد بەکاریگـەری هۆکـارە ژینگەییـەکانی وەکـو تیشکی خۆرو باران و بە تێپەڕینی ڕۆژگارێکی زۆر، ئەم تەنـە ئەندامییـە یان ئەو خانەیە گۆڕا بۆ ووردترین گیاندار کە ئـەم گیانـدارە سـەرەتاییە هیچ هەستێکی بینین و بیستن و بیرکردنەوەو هەستەکانی تـری نـەبوو، پاشــان بــەگوێرەی پێویسـتی و گونجـانی لەگـەڵ ژینگەکەیـدا هەسـت و ئەندامەکانی لەشی پەیدا کردووە، جا بەرە بەرە بە تێپەڕ بوونی کات و بەهۆی کاریگـەری سروشـت و خـۆ ڕاهێنـان لەگـەڵ ژیـان و ژینگـەدا، ئـەم گیاندارە پەرەی سـەندووەو لـە پەرەسـەندن هـەر بـەردەوام بـووە تـاوەکو گەیشـتۆتە قۆنـاغی دروسـت بـوونی گیانـدارە ئاوییـەکان و خشـۆکەکان و بڕبڕەدارەکان و باڵدارەکان کـە ئەمانـە هـەمووی لـە یەکترییـەوە دروست بوون و گۆڕاون و گۆڕان هـەر بـەردەوام بـووە تـاوەکو گەیشـتۆتە قۆنـاغی دروست بوونی گیاندارێکی زیرەك و هۆشیار کە ئەم گیاندارە دوو لقی لێ جیا بوویەوە کە یەکێکیان بووە هۆی پەیدا بوونی مەیموونەکان و ئـەوی تریش مرۆڤی لـێ پەیـدابوو، سـەرەتا مرۆڤـەکان هـیچ عـەقڵیان نـەبووەو هیچیان نـەدەزانی و نـەیان دەتـوانی قسـە بکـەن، پاشـان گـۆڕاوەو پـەرەی سەندووە تاکو بۆتە ئەو مرۆڤە عاقل و زیـرەك و هۆشـیارەی ئـەمڕۆ)...

ئەم تیۆرە ڕای وایە کە یەکەم کرداری گیانـدارە سـەرەتاییەکە بۆ بـەرگری کردن لەخۆی لە ترسی لەناوبەرە ژینگەییەکان، ئەوە بـوو کـە گیاندارەکـە خۆی داپۆشی بە بەرگێکی کلسی بـۆ خۆپاراسـتن لـە بەرامبـەر کارتیاکـەرە ژینگەییە دژوارەکانی ئەو کاتە، زانای فەرەنسـی (لامـارك) دەیـووت یەکـەم پایەی گیانداران لە زیندەوەرێکی بچووك دەستی پێکرد کە پێـی دەووتـرێ (بۆلیب). واش وەسفی ئەو گیاندارەی دەکرد کە زیندەوەرێکە دەیتوانی لـە ڕێگـەی هـەر شـوێنێکی لەشـی بێـت خـۆراك بمـژێت و هـیچ هەسـتێکی بەرکـەوتن و هەناسـەدان و زۆربـوون و شـتی تـری نـەبوو، بـەپێی بـیروڕای لامارك، بۆلیب بنـەچەی سەرجەم زینـدەوەرو گیاندارانە کە قۆناغ بەقۆناغ لەژێر کاریگـەری سروشـت دا پـەرەی سـەندووە تـاوەکو گەیشـتۆتە قۆنـاغی دروسـت بـوونی مـرۆڤ.. بـانگ خـوازانی پەرەسـەندن ڕایـان وایـە کـە ئـەو گیاندارانـەی لەسـەر سـك دەڕۆیشـتن (خشـۆکەکان) گـۆڕاون بـۆ گیانـداری قاچـدار، پـەڕدارەکان و باڵـدارەکان گـۆڕاون بـۆ بڕبڕەدارەکـان بـەگوێرەی پێویستی و خۆگونجاندنیان لەگەڵ ژینگەکـەیان.. لـەو کاتـەی کـە (تۆمـاس مـالثوس) ی ئابوریناسـی ئینگلیـزی لـە سـاڵی ١٨٣٨ز دا لـە توێژینـەوە ئابورییەکەیدا ئەوەی ڕاگەیاند کە ڕێژەی بەرهەمە خۆراکیـەکان بـەردەوام لە کەم بوون دایە بە پێچەوانەی ژمـارەی دانیشـتوان کە لـە زۆر بـوونێکی هەڕەمـەکی دایـە، دارویـن لـە ژێـر نیگـای ئـەم لێکدانـەوە ئابوریـیـەی مالثوسدا، بیری بە لای ئەوە داچوو کـە لـە ئـەنجامی ئـەو جیاوازییـەی لـە نێوان ڕێژەی ژمارەی دانیشتوان و بڕی خۆراکدا هەیە ململانێ و ڕکابـەری دروسـت دەبێـت و پێشـبڕکێ بـۆ دەسـت بەسـەر داگـرتنی خـۆراك سـەر هەڵدەدات لە نێـوان مرۆڤـەکان، دواتـر دارویـن ئـەم یاسایەی کـردە یەکـەم

بنــەمای زانسـتی لــە تیۆرەکەیـداو نـاوی نـا (ململانـێ لـە پێنـاو مانـەوە) (الصــراع مــن أجـل البقــاء)،، داروێــن دەیــووت ســەرجەم گیانــداران و زینـدەوەران لـەململانێ و ڕکابەرییـەکی بـەردەوام دان لـە پێنـاو پاراسـتنی ژیانیــان جــا ڕکابەرییەکــە لــە پێنــاو دەســتکەوتنی خــۆراك بێــت یــان داگیرکردن و دەست بەسەردا گرتنی خانوو و ماڵ و دارستان و هەر شتێکی تـری لـەم جۆرە کـە بـۆ ژیـان مـەرج و پێویسـت بێـت، ئینجـا کاتێـك ئـەم ڕکابەرییە دەگاتە لووتکە، لەو کاتـەدا هێزێکـی تـری سروشـتی کـاری خـۆی دەکــات و وا بریــار دەدات کــە گیانــدارە بــەهێزەکان لــەو ڕکابەرییــەدا سەربکەون و ئەوانەش کە لە ڕکابەری ژیـان دا لاوازو بـێ هێـزن، دەمـرن و لـەناو دەچـن و بـەرە بـەرە جۆرەکـەیان بنـەبڕ دەبێـت (الإنقـراض)،، ئـەو هێــزەش کــە بڕیــاری مانــەوەو نەمانــەوەی گیانــداران دەدات لــە لایــەن داروینــەوە بــە (هەڵبــژاردنی سروشــتی) نــاو نــراوە، واتــە سروشــت ئــەو گیاندارە هەڵدەبژێرێ کە گونجاوە بۆ ژیـان و ئەوانـەش کـە نـەگونجاوو بـێ هێـزن سروشـت لـەناویان دەبـات.. داروینیـەکان نموونـە بـەوە دەهێننـەوە کاتێـك دڕندەیـەك هێـرش دەکاتــە سـەر کۆمەڵـە ئاسـکێك دەبینـرێ کـە ئاسکەکان دەکەونـە ڕکابـەری لـە غـاردان و هـەڵاتن لـە پێنـاو ڕزگـاربوون و مانــەوە لــە ژیــان دا، جـا لــەم ڕکابەرییــەدا ئـەو گیاندارانــەی کـە بــەهێزو خێـران لـە ڕاکـردن دا ڕزگاریـان دەبێـت و سروشـت هـەڵیان دەبـژێرێ بـۆ مانەوە لە ژیان دا، بەڵام بێ هێزەکـان و ئەوانـەی توانـای ڕاکردنیـان نییـە، دەبنە نێچیری دڕندەکەو لـەناو دەچن، تیـۆری (ململانـێ لـەپێناو مانـەوە) ترسـناکترین و مەترسـیدارترین فکـرەی داهێنـراوی مرۆڤایەتییـە چـونکە ڕکابـەری و ململانـێ لـە پێنـاو خـۆراك و ژیـان بـە یاسـایەکی ڕەوای ژیـان

دەزانێــت، ڕەحمــەت و بــەزەیی لــەم فکرەیــەدا نییــەو لای ئاســاییە کــە گیانــداران و هــەتا مرۆڤــەکانیش بکەونــە شــەڕانگێزی و ململانــێ و لــەناو بردنــی یــەکتری لــەپێناو دەســت بەســەر داگــرتنی هۆکارەکــانی ژیــان،، ئــەم فکرەیــە ئەگــەر لەســەر ژیــانی مرۆڤــەکان جــێ بــەجێ بکرێــت ئــەو کاتــە کارەسات دەخولقێنێت، چونکە حەق دەدات بە زلهێزو توانادارەکـان کە بـە هەموو شێوازێك ململانــێ لەگــەڵ بــێ هێزەکـان بکـەن تەنانــەت ئەگــەر بــە لەناو بردنیشیان بێت لە پێناو سەرکەوتن و زاڵ بوونی بەهێزەکان بەسەر کۆمــەڵگای مرۆڤایــەتی،... لــە دوای ئــەو دوو ڕێســا ئەفســووناوییەی کــە داروین بانگەشـەی بـۆ دەکـرد (ململانێـی مانـەوەو هەڵبـژاردنی سروشـتی)، شتێکی تر دێتە بەرچاومان لـە کاتی لـێ وورد بوونـەوەمان لـە تیۆرەکـەی داروین کـە ئـەویش بریتییـە لـە ڕێسای (**خۆگونجانـدن لەگـەڵ ژینگـە**)، زانایانی مەنهەجی پەرەسـەندن لـە ژێـر چەتری بـاوەڕە پتەوەکـەیان بـەم بیردۆزە هەمەجی و پڕ لە مەهزەلەیەی داروینـدا، ڕایان وایە کە گیانـداران ئەندامــەکانی لەشـیان دەگۆڕێـت بـە گـوێرەی چۆنیەتی بـەکارهێنانیان و گونجانــدنیان لەگــەڵ بــوارە ژینگــەیی و ژیانیــەکان، جــا ئــەم گۆڕانــە جەســتەییە دەگوازرێتــەوە بــۆ نــەوەکان و ئــەم گۆڕانکارییــە نوێیــە لــە وەچەکانی داهاتوودا دەردەکەوێ و بە تێپەڕ بوونی ڕۆژگار جۆرێکی نـوێی گیانــداری لــێ پەیــدا دەبێــت، ژینگــە لــە دیــدگای تیــۆری پەرەســەندن دا گەورەترین و کاریگەرترین هۆکاری ڕوودانی گۆڕانکارییـە جەستەییەکانە، واتە گیانداران بە گوێرەی کارتیاکەرە ژینگەییەکان گۆڕانیـان بەسـەر دادێ و ئەگەر کاریگەری ژینگە بەهێزو بەردەوام بێ ئەوا لە پاش تێپـەڕ بـوونی زەمەنێکـدا جـۆری گیانــداری کـارتێکراو دەگۆڕێـت بـۆ جـۆرێکی تـر، بـۆ

نموونە لە ژینگەی گەرم دا مرۆڤ پێستی ڕەش دەبێت و لە ژینگەی نێو دارستاندا مەچەك و باسکی گیانداران بەهێز دەبێت تاوەکو توانای خۆ هەڵواسین و خۆهەڵدانی سەر دارەکانیان هەبێ.. جا بەم پێیە ئەگەر گیاندارەکە لە ژینگەکەیدا بە بەردەوامی پێویستی بە خۆهەڵدان بۆ بەرزاییەکان هەبێت، ئەوا ڕەنگە بە گوێرەی پێداویستی ژینگەکەی باڵی بۆ دروست ببێت،.. (باتست لامارك) ی زانای بایۆلۆجی فەرەنسی بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە گیانداری زەڕافە لە کۆندا زەڕافە نەبووە، بەڵکو گیاندارێکی تری وەکو مامز یان هاوشێوەی مامز بووە بەڵام لەبەر ئەوەی بەردەوام دەمی خۆی بۆ خواردنی گەڵای دارە بەرزەکان بەرزکردۆتەوە، بۆیە بە گوێرەی پێداویستی ژینگەکەی، ملی بەرە بەرە درێژ بووەو دواتر سیفاتی درێژی مل لە وەچەکانیدا دەرکەوت و نەوەکان بە ملێکی درێژ لە دایك بوون، کەواتە لێرەدا جۆرێکی نوێی گیاندار (زەڕافە) لە نەبوونەوە پەیدا بوو بەهۆی خۆ گونجاندنی گیاندارێکی تر لەگەڵ ژینگەکەیدا، ئەم ڕایەی (لامارك) لە لای داروین ئەوەندە پەسند بوو بە جۆرێك کە لە شێوەی ڕاستییەکی زانستی لە کتێبەکەی خۆیدا تۆماری کردەوە هەروەك دەڵێت: (زەڕافە لەبەر بەرزی باڵاکەی و درێژی ملی و قاچەکانی پێشەوەی، بۆیە پێکهاتە جەستەییەکەی ڕێك لەگەڵ ژینگەکەیدا گونجاوە بۆ خواردنی گەڵای لقە بەرزەکان، هەر بۆیە دەبینین کە زەڕافە توانای دەستکەوتنی خۆراکی وای هەیە کە هیچ ئاژەڵێکی تر ئەو توانایەی نییە).. هەروەها داروینیەکان دەڵێن ئەو وورچانەی کە لە کەناری دەریادا ڕاوی ماسیان دەکرد، بەرە بەرە بۆ گرتنی ماسی هاتنە ناو دەریاو تا لە سەردەمێکدا گۆڕان بۆ نەهەنگ، جا بەپێی ئەم ڕایە بێت،

ڕەنگە مـرۆڤیش ئەگەر چەند جارێـك بـۆ مەلـەوانی بچێتە نێـو دەریـا لەوانەیە ڕیشووە کەوانەکانی بۆ دروست بێ و ببێتە نەهەنگ یان مرۆڤی دەریا، بیروڕایەکی تری ئەم تیۆرە ئەوەیە کە ئەگەر گیانـدار ئەنـدامێکی جەستەی بەکار نەهێنا یان بە کەمی بەکاری هێنـا لـە ژیانیـدا، ئـەوا بـەرە بەرە ئەو ئەندامە کز دەبێ و تا دەگاتە ساتێك کە ئـەو ئەندامـە نامێنێـت لـە جەستەیداو بـە تێپـەڕینی چـەند سـەدەیەك گیاندارەکـە دەگـۆڕێ بـۆ جۆرێکی تری نەبینراو. هەروەها بازدان (الطفـرة) کـە لامـارك باسـی لێـوە دەکرد، بـە ڕای زانایـانی پەرەسـەندن هۆکارێکـە بـۆ پەرەسـەندن و گـۆڕانی گیانداران لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر، (بازدان) بریتی یە لە شـێوان و لـە باری ئاسایی لادانی زانیارییەکانی ناو گەردی (دی ئـێن ئـەی) لـە ئـەنجامی بەرکەوتنی شریتەکانی ترشی نـاوەکی بـە کـارا دەرەکیـەکانی وەکـو تیشـکی ئــێکس (×) و ڕادیۆســۆم و مــاددە کیمیاییــەکان، بــازدان لــە ڕوانگــەی داروینیەکانــدا هۆکـارە بـۆ پەرەســەندن و دروســت بـوونی جـۆری نـوێی گیاندار، بەڵام خۆی لە ئەساسدا ئەم ڕایە هیچ بنەمایەکی ڕاستی و زانستی نییە، چونکە بـازدان بریتییـە لـە نەخۆشـییەکی کوشـندەی بۆمـاوەیی کـە ئەگەر لە هەر گیاندارێکدا ڕووبدات یەکسەر یان پاش ماوەیەك دەیکوژێـت نەك بیگۆڕێت بۆ گیاندارێکی تر، کاتێك ئیفلیج بوونی لـەناکاو لـە یـەکێك ڕوودەدات لە ئەندامەکانی جەستەیدا بەهۆی خۆدانە بەر تیشـك یـان هـەر هۆکارێکی تـر، بێگومـان ئەمە بازدانە، جا ئایا دەکـرێ بـووترێ ئـەو مرۆڤـە بەم بازدانە دەگۆڕێ بۆ کائینێکی تر؟، زانای فەرەنسی (بـییر بـول کراسـي) کە لایەنگری پەرەسەندنەو سەرۆکی پێشووی ئەکادیمیای زانستی بوو، لـەم بارەیـەوە دەڵێـت: (هـەر چـەندە ڕێـژەی بـازدان لـە گیانـداردا زۆر بێـت،

هەرگیز نابێتە هۆکار بۆ پەرەسەندن)، کەواتە بازدان هەرگیز هۆکار نییە بۆ پەرەسەندن و گۆڕانی گیانداران بەڵکو لە نەخۆشییەکی کوشندە زیاتر هیچی تر نییە.. یاسای چوارەمی بیردۆزی پەرەسەندن بریتییە لە (بۆماوە)، داروین دەڵێت دوای ئەوەی کە گیاندار لە ژێر کاریگەری هەڵبژاردنی سروشتی و خۆگونجاندنی لەگەڵ ژینگەکەیدا سیفاتی نوێی لاشەیی پەیدا دەکات و گۆڕان لە جەستەکەیدا ڕوودەدات، ئەم گۆڕانە بە بۆماوە دەگوازرێتەوە بۆ نەوەکان و جۆرێکی نوێی گیاندار پەیدا دەبێت، بێگومان ئەم بیروڕایە زۆر دوورە لە ڕاستی و بە تەواوی پێچەوانەی یاساکانی بۆماوەزانییە، چونکە زانیاریەکانی ناو شریتی ترشەلۆکی ناوەکی جێگیرەو تەنها ئەو سیفاتانە دەگوزرێنەوە بۆ نەوەکان کە لە نێو تۆماری ئەو شریتانەدا هەلگیراون و هەر گۆڕانێکیش لە جەستەی گیاندار ڕوو بدات، هەرگیز لە نێو ئەم شریتانەدا تۆمار نابن، کەواتە سیفەتی نوێی دەستکەوتوو بە هیچ جۆرێك لە نەوەکانی دوای گیاندارەکە دەرناکەون.

# بەشی شەشەم

## ژیان چۆن دروست بوو؟

(ژیان چۆن دروست بوو؟) ئەو پرسیارە سەخت و دژوارمیە کە بەر لە هەزارەها ساڵ پێش زایین کاروانی فەلسەفە لەپێناو دۆزینەوەی وەڵامەکەیدا بەرێکەوتووەو سەرجەم دۆڵ و نشێوو پانتاییەکانی بڕیوەو دوو چاوەکانی هەڵسوڕاندووە لە نێو سەیرو سەمەرەو نهێنییەکانی گەردوون و ژیان دا، بەڵام لە سەرەنجامدا هەگبەی پرسیارەکەی بە بەتاڵی هێناوەتەوەو هەرگیز نەیتوانیوە سەرەتایەك بۆ ژیان دیاری بکات.

هەر چەندە زانست و زانایان بەرەو لووتکە بەرزەکانی داهێنان و دۆزینەوەی سەیر بڕۆن، ئەوا هەردەم خاڵێك هەیە کە زانایان لەبەر دەمیا چۆك بە زەوی دادەدەن کە ئەویش ئارێشەی سەرەتای دەرکەوتنی ژیانە. هەزارەها بابەتی ئاڵۆزو شتی سەیر هەیە کە زانست بە جورئەتەوە بڕیاری لەسەر داوە بەڵام تا ئێستا سەرەتای دەرکەوتنی ژیان کەسێك نەیتوانیوە یەك ووشەی سەلمێنراوی زانستی بخاتە روو لە بارەیەوە. زۆر سەیرە کە زانایان تەنها لەبەر ئەوەی پێیان دەووترێ (زانا) و پێگەی کۆمەڵایەتیان بەرزە، هەرگیز ناتوانن بڕوا بە موعجیزەکان بهێنن چونکە لایان وایە چۆك دادان و تەنازولە، بەڵام زۆر لایان ئاساییە بڕوا بکەن کە ژیان لە تەنۆچکەیەکی نەبینراوی بێ هەست دروست بووەو هەرچی

بوونەوەری زیندوو هەیە بە مرۆڤیشەوە بریتین لە سەرەنجامی پەرەسەندنی ئەو تەنۆچکەیە. ئەمە چ تەنۆچکەیەکە کە بە ڕای ئەوان، ژیان و گیان و گیاندارانی بڵاو کردۆتەوە لە سەرجەم دۆڵ و نشێوو شاخەکان و دەشتەکان و نێو قووڵایی دەریاو زەریاکان...

فەلسەفەو زانست لە سەدەی هەژدەو نۆزدەدا، زۆر بە جددی دەستی دایە توێژینەوە لە بارەی سەرەتای دەرکەوتنی ژیان کە لەم سەردەمانەدا چەندین بیردۆزی فکری و زانستی لەلایەن سروشتناسانەوە داهێنران، ئەم تیۆرانە زیاتر سیمایەکی ماددییان پێوە دیاربوو کە لە ڕووالەتدا هەموویان لەیەك دەچوون و بەرەو یەك فکرە بانگەوازیان دەکرد هەر بۆیەشە کە مرۆڤ دەتوانێت یەك ڕەخنەی گشتگیر ئاراستەی هەر هەموویان بکات ...

وەك دەرکەوتووە کە گۆی زەوی لە سەرەتاو پێش هەبوونی ژیان تیایدا، هەمووی بیابان بووە، تەنها ئەو ماددانەی لە سەردا هەبووە کە لە دوای سارد بوونەوەی زەوی پەیدا بوون. هەروەها نایترۆجین و دوانۆکسیدی کاربۆن و هەڵمی ئاو بریتی بوون لە گازە سەرەکییەکانی ئەو کاتەو و ئۆکسجینیش بە هەڵگیراوی لە نێو توێکڵی زەوی دا بوونی هەبوو. دواتر ووشکانیەکان بەسەر ئۆقیانۆس و دەریاکان کەوتن و گۆڕان و لێك ترازانی هەمەجۆر بەسەر بەردەکان دا هاتن و بڕێکی زۆر لە بەردی لاوەکی دروست بوون. لە ڕووی ماددەوە تەنها ئەو ماددە نائەندامییانە هەبوون کە لە پێکهاتەی بازلت و گرانێت و بەردە ئاگرییەکان و بەردە گۆڕاوەکاندا هەبوون. هەروەها نیشتووەکانی وەکو بەردی کلس و مەرجان

و تەباشیر هـەرگیز بوونیـان نـەبوو. ڕەنگـە ئـاوی ئەوکاتـەش لـە پلەیـەکی گەرمی زۆر بەرزو جێگیر دابێت ...

ئـەو ژینگـە سـەرەتاییەی کـە باسمـان کـرد، لـەلای هەنـدێك لـە زانایـان (دایکـــی ژیانـــە) و بـــە ڕای ئـــەوان هۆکـــارو کارتیاکـــەرە ژینگـــەیی و سروشتییەکانی ئەوکاتە بۆتە هۆی گەشەکردنی تەنۆچکەیەکی ئەنـدامی و ژیان لەم تەنەوە سەرچاوەی گرتووە..

زاناو نووسەری چالاکی بـواری ووزەی نـاوەکی (جۆرج جامۆڤ) کـە بـۆ ماوەیەك ڕاوێژکاری لێژنـەی ووزەی نـاوەکی و هێـزە چەکدارەکان بـوو لـە کتێبی (نشوء الکون) دا دەڵێت :

★ لەو کاتەی کە مەجەڕڕەکان دەستیان کـرد بـە جیـا بوونـەوەو لێـك دوورکەوتنـەوە بـە هـۆی فـراوان بـوون و بڵاو بوونەوەیـەکی بـەردەوامی گەردوون، ئەو ماددەی کە لـە نـاو مەجـەڕڕەکان دا هـەبوو چـڕبوویەوە و گۆڕا بۆ تەنی قەبارە بچووك کە پێیان دەوترێ (ئەستێرە یەکەمییەکان)، هەروەها پلەی گەرمی ناوەوەی بە جۆرێك بەرز بوویەوە کە گونجاو بێت بـۆ ڕوودانـی کارلێـك لـە نێـوان هایـدرۆجین و توخمـە سـاکارەکانی تـر. بۆشاییە گەردوونییەکان بە ئەستێرەی بریسکەدار پڕبوویەوە.

لەو کاتەی کە ئەستێرەکان دروست بوون بەهۆی چـڕبوونەوەی مـاددە گازییەکانی ناو مەجەڕڕەکان، هەندێك ماددە تۆزێك بەرەو نزیك یەکتری جیابوونەوەو لەمانەشەوە (سیستـەمی ئەسـتێرە گەڕۆکـەکان) دەرکـەوت. ئەو ئەستێرە گەڕۆکانە لەبەر بچووکی قەبارەیان تەنانەت نەیان دەتوانی سەرچاوەکانی ووزەی ناوەکی خۆیان پەرە پێ بدەن بۆیە بەخێرایی سارد بوویەوەو توێکڵێکی بەردینی ڕەقی بۆ دروست بوو. پاشان بەهۆی تیشکی

ئەو خۆرانەی کە لە دەورەیـەوە بـوون پێکهاتـە کیمیاویـەکانی سـەر ئـەم گەڕۆکانە دەستیان کرد بە گۆڕان و پەرەسەندن. بەم هۆیەشـەوە ماددەی ئەندامی ئاڵۆز گەشەیان کردو خاکی سەر ئەستێرە گەڕۆکەکان پۆشاکێکی سـەوزی بـە گیـاو دارەکـان پۆشـی، ئینجـا ئاژەڵـەکان دەرکـەوتن.. پاشـان مـرۆڤ... سـەرەتا مرۆڤەکە سـادەو سـاکار بـوو، بـەڵام دواتـر پێکهاتەکـەی پەرەی سـەندو گۆڕا بـۆ ئـەو مرۆڤـە زیرەکـەی ئـەمڕۆ کـە توانـای وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارانەی هەیە کە لە بارەی ملیارەها ساڵ پـێش دروسـت بوونی خۆیەوە لێی دەکرێن...

ئەم فکرەیەو چـەندەها تیـۆری تـری پەیوەسـت بـە پەیـدا بـوونی ژیـان هـەن بـەڵام هـەرگیز بابەتەکـە نابڕێنێتـەوە و تێنـوێتی زانسـت ناشـکێنێت چونکە نهێنی دەرکەوتنی ژیـان لـە خۆیـەوە یـان بـەهۆی کاریگـەری ژینگـە یـان بـە ڕێکـەوت بابەتێکـە زیـاتر پشـت بـە هێـزی خـەیاڵ و ئەندێشـە دەبەستێ نەك متمانە بکاتە سەر ڕاستەقینەی زانستی .

بیردۆزی (دروست بوونی ژیان لە تەنۆچکەیەکەوە بە هـۆی کاریگـەری ژینگە) هەرچـەندە ڕزگـاری نابێـت لـەژێر چـنگی چـەندین کـەم وکـوڕی و هەڵەی سەخت و ڕووخێنەر، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا پێشوازییـەکی تـەواوی لێکـرا لــە لایــەن زانایــانی پەرەســەندن و هــەردەم هــەوڵی ســەلماندن و چەسپاندنی ئەم تیۆرەیان دەدا. زانـای بـەناو بـانگی پەرەسـەندن (سـتانلی میلەر) لە ساڵی ١٩٥٣ز لە زانکۆی (شیکاغۆ) بە ناوبانگترین تاقیکردنـەوەی ئەنجام دا بۆ سەلماندنی ئەم فکرەیە کە هـەوڵی دا چـەند گـەردێکی (ترشـە ئەمینییەکان)لە نەبوونەوە دروست بکات...

## تاقی کردنەوەکەی ((میلەر))

**(میلەر)** بڕوای وا بوو کە لە سەرەتای درووست بوونی گۆی زەوی و پێش دروست بوونی ژیان، ئاوو هەوای ئەو کاتەو باری ژینگەیی ئەو سەردەمە بۆتە هۆی گەشەسەندنی تەنۆچکەیەکی ئەندامی و لەمەشەوە ژیان دروست بووە. لەژێر تیشکی ئەم باوەڕەدا **(میلەر)** هەڵسا لاسایی ژینگەی ئەو سەردەمەی کردەوەو لە ناو شوشەیەکی تاقیگەییدا ژینگەیەکی دروست کرد کە بە ڕای ئەو، ژینگەی سەرەتای ژیان هەروەك ژینگەکەی ئەو وابووە. میلەر لەم تاقیکردنەوەیەدا مەبەستی ئەوە بوو کە لە ناو ئەو ژینگەیەدا ماددەیەکی ئەندامی بۆ دروست بێت بۆ ئەوەی بسەلێنێت کە ژیان هەروا دروست بووە لە نێو ژینگەی چاخە کۆنەکاندا.

میلەر ڕای وابوو لە سەرەتای ژیان دا گازی ئەمۆنیا و میثان و هەڵمی ئاو بریتی بوون لە پێکهاتەکانی ئاووهەوای ئەوکاتە، بۆیە هەڵسا بە بەکارهێنانی گازی ئەمۆنیا و میثان و هەڵمی ئاو لە دروستکردنی ژینگە دەستکردەکەیدا. جا لەبەر ئەوەی لەم ژینگەیەدا ئەو گازانە لەگەڵ یەکتری کارلێك ناکەن، بۆیە هەڵسا بە درووژاندن و تێپەڕاندنی ووزەی کارەبایی بەناو ئەم ژینگەیەدا چونکە وای دانا کە کاتی خۆی ووزەی بروسك کارلێکی بەم گازانە کردووە لەژینگە سەرەتاییەکەدا. پاشان میلەر ئەو تێکەڵە گازییەی تا پلەی ١٠٠ی سیلیزی کوڵاند بۆ ماوەی هەفتەیەك، ئینجا هەڵسا بە شیکردنەوەی ماددە کیمیاییەکانی ناو ئەم تێکەڵە گازییەو لە ئەنجام دا دەرکەوت کەسێ جۆر لە گەردی (ترشە ئەمینییەکان) زیادی کردووەو لە نەبوونەوە دروست بووە.

دروست بوونی ئەم ترشە ئەمینیانە وای لە میلەرو زانایانی پەرەسەندن کرد کە بانگەشەی دروست بوونی ژیان بکەن بەهۆی گەشەسەندنی تەنێکی ئەندامی لە ڕێگەی کارتیاکەرە ژینگەییەکانەوە. ئەم تاقیکردنەوەیە بۆ ماوەیەك بووە چەکێك بە دەست زانایانی پەرەسەندن بۆ سەلماندنی بیرو ڕاکانیان، بەڵام تاقیکردنەوەکە یەکسەر پووکایەوەو باوی نەما چونکە:

١- پاشان ئەوەی کە ترشە ئەمینییە دەستکردەکان دروست بوون، میلەر یەکسەر ترشە ئەمینییەکانی لە ژینگەکە جیا کردەوە بەهۆی ئامێری (کۆڵد تراپ) واتە (تەڵلەی سارد) کە ئەگەر بێتوو جیای نەکردبایەوە ئەوا باری ناهەمواری ژینگەکە یەکسەر ترشە ئەمینییەکانی لەناو دەبرد. بێگومان ئەگەر ڕاستیش بێت کە کاتی خۆی لەژینگەی سەر زەویدا تەنۆچکەیەکی ئەندامی گەشەی کردووە ئەوا ئەو تەنە یەکسەر دەمردو لەناو دەچوو چونکە ئەو کاتە هیچ هۆکارێك نەبووە بۆ جیاکردنەوەی تەنەکە لە ژینگەکە.

زانای کیمیایی (ڕیشارد بلیچ) لە بارەی پووچەڵی ئەم تاقیکردنەوەیە دەڵێت: **ئەگەر ئەو جیاکردنەوەیە نەبوایە، ئەوا یەکسەر ترشە ئەمینییەکان لەناو دەچوون بەهۆی تەزووی کارەباکەوە..**

٢- ئەو ژینگەیەی کە میلەر دروستی کردبوو، زۆر جیاواز بوو لەگەڵ ژینگەی سەرەتای دەرکەوتنی ژیان. زانایان دەریان خست کە گازەکانی ئەو کاتە هەرگیز میثان و ئەمۆنیا نەبووە هەروەك میلەر وای بەخەیاڵ داهاتبوو، بەڵکو گازی نایترۆجین و دوانۆکسیدی کاربۆن پێکهاتە سەرەکییەکانی هەوای ئەوکاتە بوون و ئەو گازانەش هەرگیز لەبارو گونجاو

نـین بـۆ دروسـت بـوونی گـەردی ترشـە ئەمینییـەکان. پـاش چـەند سـاڵێك میلەر بەخۆی دانی بەم ڕاستیەدا نـا کـە ژینگـەکەی ئـەو زۆر جیـاواز بـوو لەگەڵ ژینگەی ئەوکاتە.

٣- هـەروەها ئەگـەر وا خـەیاڵ بکـەین کـە ترشـە ئەمینییـەکان لـە نێـو ژینگەی سەرەتای ژیاندا دروسـت بـوون، ئـەوا ئاسـتی ئۆکسـجینی ئـەو کاتـە ئەوەندە ئۆکسێنەر بـووە بـەجۆرێك کـە هـەموو گـەردەکانی لـەناو دەبـرد، هـەروەکو چـۆن پاشـماوەی ئاسـن و یۆرانیـۆمـە ئۆکساوەکانی نـاو بـەردەکان ئەم ڕاستییە دەردەخەن.

تـاقی کردنـەوەکـەی (میلـەر)، پـێش ئـەوەی پووچـەڵ بێتـەوە، وەکـو مـوعجیزەی زانسـتی سـەیری دەکـراو ناوبـانگی ئەوەنـدە بـەرز کرایـەوە بەجۆرێك کـە ڕۆژنامـەو گۆڤـارە زانستییەکان وەکو بابـەتێکی داهێنـراوی زانستی باسیان لێوە دەکردو تەنانەت لە مانشێتی بابەتـەکانی نێـو هەنـدێ گۆڤـارە زانسـتییەکان زۆر بـە ڕاشـکاوانە دەنووسـرا (میلـەر ژیـانی دروسـتکرد)!. بـەڵام هـەروەك بینیمـان کـە پـاش چـەند سـاڵێك تاقیکردنەوەکـە خـۆی ڕانـەگرت و هەرەسـی هێنـا بەرامبـەر ڕاسـتییە زانستییەکان و تواناى نەبوو لێکدانەوەیەکی سەرکەوتوو بۆ سەرەتای ژیـان بکات و بابەتی بنچینەی ژیانیش هەر بە نادیاری و شاردراوەیی مایەوە.

★ بیردۆزێکـی تـر لـەو بیردۆزانـەی کـە پەیوەسـت بـوون بـە بابـەتی بنچـینەی ژیـان بـریتی بـوو لـە بـیردۆزی (هـاتنی ژیـان لـە هەسـارەیەکی ترەوە). ئەم بیروڕایـە بـۆ یەکـەم جـار بانگەشـەی بـۆ کـرا لـە لایـەن زانـای سویسڕی (سوانتا ئەرینیۆس) (١٨٥٩-١٩٢٧) کە ئەم زانایـە لـە ساڵی١٩٠٣ز دا خەڵاتی (نۆبڵ)ی بەدەست هێنا لە (کیمیا)..

(ئەرینیۆس) لەم بیردۆزەیدا ڕای وا بوو کە (زیندەوەرە بەچاو نەبینراوە زیندووەکان، هەردەم لە بۆشایی گەردوون دا بوونیان هەبووەو پاشان لەسەر هەسارەی زەوی جێگیر بوون و بەرە بەرە بەهۆی هۆکارەکانی پەرەسەندن زیندەوەری جیاوازیان لێ دروست بوو.). هەروەها (ولیەم طمسن) ڕای وابوو کە ژیان بەهۆی نەیزەك و هاوێژراوەکانی ئاسمانەوە، لە ئاسمانەوە هاتۆتە سەر زەوی و لەوێوە گەشەی کردووە.

بەڵام ئەم بیردۆزە هەر لە سەرەتادا لە بێشکەدا مردو پووکایەوەو دەرکەوت کە بە تەواوی لە نێو هەڵەدا نوقوم بووە، چونکە ئەو هەموو گازو تیشکە کوشندەو ژەهراوییانەی کە لە بۆشایی ئاسمان داهەن، بوار بەهیچ زیندەوەرو تەنۆچکەیەك نادەن کە یەك چرکە لە ژیاندا بمێنن و هەر لەگەڵ یەکەم بەرکەوتن لە ناوی دەبات و دەیکوژێت..

★ لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم دا زانایانی پەرەسەندن بانگەشەی بیردۆزێکی تریان کرد بۆ ڕوون کردنەوەی بابەتی بنچینەی ژیان کە ئەویش بیردۆزی (پەرەسەندنی خانە) بوو. بەر لەم سەدەیە زانیاریەکانی پەیوەست بە(خانە) زۆر کەم و نادیار بوو، بەڵام لەگەڵ پێشکەوتنی تاقیگە بایۆلۆجی و کیمیاییەکان و ڕوون بوونەوەی پێکهاتەو فرمانەکانی خانە، وا هەست کرا کە نهێنی ژیان کەوتە دەست و خۆی ئاشکرا کرد. پێش ئەوەی باسی شکستەکانی ئەم بیرو ڕایە بکەین با بزانین خانە چییەو نموونەیەکیشی لێ باس بکەین.

کاتێك کە تۆوی نێرینە لەگەڵ هێلکەی مێینە یەکدەگرێ لەنێو منداڵدانی دایکدا، هێلکەی پیتراو دروست دەبێت و ئەو هێلکە پیتراوە بریتییە لە (خانە). ئەو خانەیە لە نێو منداڵدان دا دابەش دەبێت بۆ دوو

دانــەو ئــەم دووانــەش بــۆ چــوارو تــاوەکو دەگاتــە ملیارەهــا خانــەو لــە سەرەنجامی ئەم دابەش بوونەدا ئەندامەکانی لەش دروست دەبێت. کەواتە ئێمــە ســەرجەم ئەندامــەکانی لــەشمان بریتییــە لــە خانــە. لــە پــاش ئــەم دۆزینەوەیە زانایانی پەرەسەندن وای بۆ چوون کە لە سەرەتادا خانەیەك لــە ژینگەیــەکی ئەنــدامی گونجــاو دا بــەم جــۆرە دابــەش بووبێــت و زیندەوەرێکی لێ دروست بووبێت و بەمەش یەکەم خاڵی دەست پێکردنی ژیان لەم خانەوە دەستی پێکردووە. هەروەها ڕایان وایە کە لە سەرەتادا پێش ئەوەی خانەکە دەست بە دابەش بوون بکات، یەك خانە بەس بووە بۆ ئەوەی ژیانی لێوە دروست بێت بۆ ئەمەش ئەم زیندەوەرانە بە بەڵگە دەهێننەوە کە یەك خانەیان هەیەو تاك خانەن وەکو (**ئەمیبا و یۆگلینا و پارامسیۆم و... هتد** ).

بەڕای من ئەمە بەهێزترین بیروڕایە کە ڕەنگە توانیبێتی قەناعەت بە زۆر کەس بهێنێت، بەڵام با ئەوەش بزانین کە ئەم بیردۆزە بەرامبەر یەك پرسیار دادەڕووخێت و بە تەواوی نرخی نامێنێت ئەویش ئەوەیە کە دەڵێت:. (**ئایا لەسەرەتادا خانەکە لە کوێوە هاتووەو چۆن دروست بووە؟**)

ئەم تیۆرە هەرگیز وەڵامی ئەو پرسیارەی نەداوەتەوەو نەیتوانیوە کە ڕوون کردنەوەیەکی تەواو بخاتە ڕوو لەبارەی چۆنیەتی دروست بوونی ئەو خانەیەی کە لە سەرەتادا دەستی بە دابەش بوون کردووەو ژیانی لێ دروست بووە. ئەگەر وا گریمان بکەین کە ئەو خانەیە لە سەرەتادا لە خۆیەوە یان بە ڕێکەوت دروست بووە بەبێ ئەوەی کەسێك دروستی بکات، بێگومان ئەمە ئەوپەڕی جەهالەت و خورافەبازییەو هەرگیز زانست و مەنتیق شتی وا قبوڵ ناکات، چونکە خانە لە ڕووی پێکهاتن و فرمانەوە

ئەوەندە سەیرو ئالۆزە کە ئەگەر ملیارەها سەدە لە ڕۆژگاردا تێپەڕ بێت، هەرگیز شتی وا بە ڕێکەوت دروست نابێت. خانە زیاتر لە (١٠) بەش پێکدێ و ئەم بەشانە وفرمانەکانیان لە ڕووی ئالۆزییەوە ئەوەندە سەرسوڕهێنەرو ناوازەن بەجۆرێك کە تاکو ئێستا هیچ تاقیگەیەکی بایۆلۆجی وکیمیایی سەری لە کردارەکانی ناو خانە دەرناچێت، ئیتر چۆن بڕوا دەکرێ کە وەکو شتێکی سادەو ساکار سەیری بکرێ و سەرەتای دروست بوونی بۆ ڕێکەوت بگێڕینەوە ... ئێستا با دوو نموونە لە پێکهاتەکانی ناو خانە ڕوون بکەینەوە و بزانین کە دروست کراوێکی وائالۆز، دەکرێ بە ڕێکەوت دروست بێت..

## * ( مایتۆکۆندریا )

مایتۆکۆندریا یەکێکە لە پێکهاتەکانی خانەو سەرچاوەی دابینکردنی ووزەیە بۆ لەش. بێگومان ئێمە لەکاتی ڕۆیشتن و دانیشتن و خواردن وکارکردن و هەر جوولەیەکدا، پێویستمان بەهێز و ووزە هەیەو تەواوی ئەو ووزەیەش مایتۆکۆندریا بۆمانی ئامادە دەکات، مایتۆکۆندریا ئەو هەموو هێزو ووزەیە بۆ مرۆڤ دابین دەکات لە کاتێك دا پێکهاتەیەکی بە چاو نەبینراوی ناو خانەیەو خۆی و ئەو خانەیەی کە چۆتە ناوی بەچاو نابینرێن ئیتر چ شتێك هەیە لەمە ئالۆزتر بێت و چ عەقڵێکیش ئەوە قبوولٚ دەکات کە بە ڕێکەوت دروست بووبێت. مایتۆکۆندریا ئەوەندە بچووکە بە جۆرێك دەتوانین هەزارەها دانەی لێ ڕوو بکەینە سەر کاغەزێك کە مەودایەکەی (٢سم) بێت بەڵام کارێکی ئەوەندە سەیر لە دابین کردنی ووزە ئەنجام دەدات کە چەندین ئامێری ئالۆز توانای ئەنجام دانی ئەو کارەیان نییە. ئەگەر مایتۆکۆندریا لە ناو خانە لابدرێ و

هەزارەها ئامێری کارەبایی دابینکەری ووزە لە جێگەی دابنرێ ئەوا هیچ سوودی نییەو گیاندارەکە یەکسەر ووزەی لێ دەبرێ و دەمرێت. بەڕاستی دروست بوونی مایتۆکۆندریاو ئەندازە ڕێك و پێکەکەی دوورە لە خەیاڵاتی ڕێکەوت و بەرەو (احسن الخالقین) ڕێگەمان نیشان دەدات. باشە بۆچی زانایانی پەرەسەندن ناتوانن بڵێن ئەو (پاتری) یە بچووکەی سەعاتی دەست کە ووزە بۆ سەعاتەکە دابین دەکات بەرێکەوت دروست بووە، بەڵام زۆر بە نامەنتیقیانە دەڵێن مایتۆکۆندریا لەخۆیەوە بەرێکەوت دروست بووە؟ لەکاتێکدا مرۆڤ بەهۆی ووزەی مایتۆکۆندریاوە، سەعاتەکەو پاتریەکەشی داهێناوە!

بێگومان ئەگەر ڕامان وابێ کە خانە بە پەرەسەندن و ڕێکەوت لەخۆیەوە دروست بووە ئەوە فێڵێکی فکری و زانستییە لە خۆمانی دەکەین چونکە پێکهاتە ئاڵۆز و دژوارەکەی خانە، جیهانێکی وایە کە بە ملیارەها ملیار ساڵ شتی وا بە پەرەسەندن دروست نابێت. هەروەکو زانای بە ناوبانگی ڕووسی (ئۆبارین) کە لایەنگرێکی زۆر بەهێزی فکرەی پەرەسەندنە، دان بەم ڕاستیەدا دەنێت و دەڵێت:

**(بە ڕاستی پاساکانی کیمیای ئەندامی هەرگیز توانای ڕوون کردنەوەی ئەو کردارو کارلێکە ئاڵۆزانەیان نییە کە لە ناو خانە زیندووەکاندا بەڕێوە دەچن)**

## گەردی ( دی ئێن ئەی )

گەردەکانی (دی ئێن ئەی) واتە ترشی ناوەکی **(الحامض النووي)** پێکهاتەیەکی تری ئاڵۆزی ناو خانەیە کە تا ئێستا زانست و زانایان بە تاساوی و سەرسوڕماوییەوە بەرامبەر ئاڵۆزیەکەیدا چۆك بە زەوی

دادەدەن. ئەم گەردانە لە شێوەی شریتی درێژو باریك لە ناوكی خانەدا هەن و بە چاو نابینرێن.

(دی ئێن ئەی) لە لەش دا كۆگای زانیاریەكانەو سەرجەم سیفاتە لاشەییەكانی گیاندار لەناو ئەم گەردانەدا تۆمار كراوە. بۆ نموونە ڕەنگی چاو و قژو درێژی و كورتی باڵاو ڕەنگی پێست و ئاستی دەنگ و نەخۆشییە بۆماوەییەكان و چەندان سیفەتی تر لەنێو گەردی (دی ئێن ئەی) دا وەكو زانیاری هەڵگیراوەو ئەو زانیارییانەش بە بۆماوە دەگوازرێتەوە بۆ منداڵەكان. ئەگەر بێتوو لە نەخۆشخانەیەك دا دوو منداڵی تازە لەدایكبوو تێكەڵ بوون و نەزانرا كامەیان هی كامە دایكە، ئەوا پزیشكی نوێ هەڵدەستێت بە بەراورد كردنی زانیاریەكانی ناو گەردی (دی ئێن ئەی)ی منداڵەكان لەگەڵ هی باوانەكان و بەمەش سیفاتی هەر كۆرپەیەك دەچێتەوە سەر هی دایك و باوكی خۆی و كێشەكە چارەسەر دەبێت.

زانستی خانەزانی نوێ دەریخستووە كە ئەگەر ئەو زانیاریانەی كە لە ناو یەك گەردی (دی ئێن ئەی) دا هەڵگیراوە بخرێتە سەر لاپەڕەو بنووسرێتەوە، ئەوا كتێبێكی لێ دروست دەبێت كە زیاتر بێت لە پەنجا هەزار لاپەرە، ئەمە لە كاتێك دا كە گەردی (دی ئێن ئەی) ئەوەندە بچووكە بەچاویش نابینرێ، ئیتر چەندە نەفامین ئەگەر ڕامان وابێ ئەم دروست كراوە ئاڵۆزو بێ وێنەیە لەخۆیەوە بە ڕێكەوت دروست بووبێت. ئاخر ئەو سروشتەی كە تەنها خاك و خۆڵ و ئاوە بە چ قەڵەمێك هەستا بە نووسینەوەی ئەو هەموو سیفاتە لاشەییانە لەسەر گەردی (دی ئێن

ئەی) و چۆن هەڵسا بە ڕیز کردن و ڕێك خستنی ئەو هەموو زانیارییانە بە جۆرێك لە سنوری عەقڵی مرۆڤ دەردەچێت.

ئێمە لە ئاستی ئاڵۆزی و ناوازەیی مایتۆکۆندریاو (دی ئێن ئەی) گەیشتین، بەڵام با ئەوە لە یاد نەکەین کە ئەم دووانە دوو پێکهاتەی بچووکی ناو خانەن و سەرجەم پێکهاتەکانی تری خانە وەکو جیهانێکی زۆر سەیرو ئاڵۆز دەردەکەون و هەریەکەیان حوکومەتێکە بۆ خۆی. جا چۆن دەکرێ کە لە سەرەتای ژیاندا بەهۆی ڕێکەوت یەکسەر شتێکی وا بێتە کایەوە کە لە دوا پلەی ئاڵۆزێتی دابێت؟..

بێگومان هەرچەندە ئەم ڕایە هەڵەیە و ڕاست نییە، بەڵام ئەگەر واش بێ بە چ بەلگەیەك خانە ئەگەر ژینگەی بۆ گونجاو بێت گەشە دەکات و ژیانی لێ دروست دەبیت؟ باشە لەو هەموو ژینگە گونجاوەی سەر زەویدا بۆچی جارێك زیندەوەرێکی سادەو سەرەتایی نادۆزرێتەوە کە بووترێ ئەمە خانەیەو بە ڕێکەوت و پەرەسەندن بۆتە زیندەوەر.

یاخود ئەگەر لە ناو شووشەیەکی تاقیگەدا، ژینگەیەك دروست بکەین کە هەروەك ژینگەی سەرەتای ژیان وابێت، ئینجا خانەیەك بخەینە ناوی، ئایا دەکرێت ئەو خانەیە پەرە بسەنێت و ژیانی لێوە پەیدا بێت؟ بێگومان عەقڵ و هۆش و ویژدان و زانست و مەنتیق لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێن ((نەخێر))!، بەڵام ئێستا ئێمە با وەکو یارییەکی گریمانی بچینە نێو بازنەی خەیاڵ و وا گریمان بکەین کە ژیان لە ئەنجامی گۆڕانی یەکەم خانەوە دروست بووە!.

بەڵام چەند دەقیقەیەك نابات دەبێت بە ناچاری لەم بیرو رایە پەشیمان بینەوە چونکە یەکسەر پرسیارەکەی پێشوو یەخەمان دەگرێتەوە کە دەیووت (ئایا خانەکە چۆن دروست بووە؟).

لێرەدا دەمەوێت نموونەیەك بهێنمەوە بۆ روون کردنەوەی ئەم بابەتەو تۆزێك بە ووردی بیری لێ بکەوە، ئەگەر وامان دانا کە ژینگەی پێش هەبوونی ژیان وەکو لاپەڕەیەکی سپی وابووەو ئەو خانەیەی کە گەشەی کردووە وەکو خاڵێك وابووە، باشە ئێمە ئەگەر بە نووکی قەلەم خاڵێك (نقطة) یەکمان لەسەر لاپەڕەیەکی سپی دانا، ئایا عەقڵ ئەوە قبوڵ دەکات کە ئەم خاڵە پەرە بسەنێ و زیاد بکات تاوەکو لاپەڕەکە لەخۆیەوە هەمووی بە نووسینی جوان و بەهێزو ئاڵۆز پڕ دەبێتەوە؟. بێگومان نموونەی دروست بوونی ژیان لە ئەنجامی گەشەکردنی خانە وەك ئەو نموونە وایە کە باسمان کرد، ئایا دەکرێ بووترێ کە مەرەکەبی خاڵەکە بە رێکەوت و(الصدفة) بڵاو بووەوەو پەرش بوو تاوەکو هەزارەها پیتی لێ دروست بوو، دواتر ئەم پیتانە هەر بە رێکەوت ریز بوون و هاتنە پاڵ یەك تاوەکو لاپەڕەکە بە نووسینێکی واتادار پڕبوویەوە؟ یاخود پرسیارێکی تر، ئایا کێ لە سەرەتادا خاڵەکەی لەسەر لاپەڕەکە دانا؟، ئەگەر قەڵەمێك لەسەر لاپەڕەیەك دابنێین ئەوا ژینگەیەکی زۆر گونجاو دەڕەخسێ بۆ دروست بوونی خاڵێك بەڵام هەرگیز دروست نابێت تاوەکو کەسێك دەست نەداتە قەڵەمەکەو نەینووسێت، ئیتر چۆن دەکرێت کە ژیان لەژینگەی کۆندا لەخۆیەوە بەبێ دەستی (الله) دروست بووبێت؟!.

ئەو زانایانەی بانگەشەی ئەم بیرۆکەیان دەکرد، دەیان ووت لە سەرەتادا ژیان لە یەك خانە دروست بووە پێش ئەوەی خانەکە دەست بە دابەش

بوون بکات، بۆ ئەمە نموونەیان بەو زینـدەوەرە تـاك خانانـە دەهێنایـەوە کە یەك خانەیان هەیە وەکو (ئـەمیبا و یۆگلینـا). کەواتـە بـە ڕای ئـەوان، یەکەم شت کـە ژیـانی هـەبێت لەسـەر زەوی دا ڕەنگـە ئـەمیبا بووبێت. وە هەروەها لە ئەنجامی دابەش بوون و کەرت بوونەکانی ئەمیباوە، سـەرجەم گیاندارەکان و مرۆڤـەکان دروسـت بـوون. بـەڵام ئێمـە هـەر لەگـەڵ ناسـینی سیفاتە جەستەیی و غەریزییەکانی ئەمیبا، دەزانین کەشتی وا مەحاڵە...

زیندەوەرێکی میکرۆسکۆبیی تاك خانەی وەکو ئـەمیبا، ئەگـەر سـەیری بکــەین و مێــژووی دەرکــەوتنی لێــك بدەینــەوە ڕەنگــە لەبــەر تــاك خانەییەکـەی و سـادەیی و سـاکارییەکەی، بـە سـەرەتاو سەرچـاوەی ژیـانی دابنێین. ئەمیبا لە ملیۆنەها گەردی ڕێك و پێك دێ و لە هەموو ئاوەکـانی جیهان دا دەژیت. هـەروەها هەسـت بـە برسـێتی و ئـازار دەکـات و بـەدوای خۆراکیش دا دەگەڕێ و لە تەنە ئازار بەخشەکان ڕا دەکات. کەواتە ئـەمیبا بە گوێرەی پێداویستی ژینگەی خۆی، غەریزەی زیـرەك و هۆشـیاری تیایـە جا بەم پێیە ئەمیبا بەگوێرەی ژینگەکەی خۆی سادەو ساکار نییەو بـەڵکو زۆر بـە توانایـە. زانایـانی پەرەسـەندن لـەم بـوارەدا زۆر هەڵـەن کاتێـك دانەیــەکی ئــەمیبا لــە ژینگەکــەی خــۆی دەردەهێــنن و لــە تاقیگــەدا توێژینەوەی لەسەر دەکەن، ئینجا دەڵێن سـادەو سـاکارە. دەی بیخـەرە نێـو ژینگەی خۆی بزانە چەندە بە ئاڵۆزی و کاملی گونجاوە لە نێـو ژینگەکـەی خۆی دا. ئەمیبا لـە نێـو زەلکاو و ئاوەکانـدا دەژی و هـەر ئاوێـك ئـەمیبای زۆر تیابێت، ڕەنگی سەوز هەڵدەگەڕێت. ئەمیبا بەرگـەی ساردی و گـەرمی ئاوەکـە دەگـرێ و هـەروەها چـاوی نییـەو خۆشـی لـە شـتی زیـان بـەخش لادەدات و خۆراکیش بۆ خـۆی دروسـت دەکـات و توانـای زۆر بوونیشـی زۆر بەهێزە. سەرەڕای هەموو ئەمانە، بە چاویش نـابینرێ، ئـیتر زینـدەوەرێك

ئەوەندە ئاڵۆزو کامل بێت چۆن دەکرێ وەکو شتێکی سادە و سەرەتایی بناسرێ و بە سەرەتای ژیان دابنرێ. یاخود خانە سەرەتاییەکە چۆن یەکسەر زیندەوەرێکی وا ئاڵۆزو بەهێزی لێ دروست بوو. کەواتە لێرەدا غەریزەو خاسیەتە بەهێزەکانی ئەمیبا دوو شت لە ئێمە دەگەیەنن. یەکێکیان ئەوەیە کە خانە بەپەرەسەندن هەرگیز یەکسەر شتێکی وا ئاڵۆزی لێ دروست نابێت. ئەوی تریان ئەوەیە کە ئەمیبا هەرگیز پەرەی نەسەندووە بۆ گیانداری تر، چونکە سیفاتەکانی تایبەتە بە ژینگەی خۆی و ئەگەر ئەمیبا بە مەبەستی پەرەسەندن بخرێتە نێو ژینگەیەکی تر یەکسەر دەمرێت. بەڵام ئەو مردنە نابێتە بەڵگە لەسەر سادەیی ئەمیبا چونکە ئەگەر مرۆڤیش بخرێتە نێو ژینگەی ئەمیبا ئەویش دەمرێت. ئەمیبا لە هەر کاتێك بۆی بگونجێت لە ناوەڕاستییەوە کەرت دەبێت و دەبێتە دوو دانە. ئەم دوو دانەش دەبێتە چوار و هەر بەم جۆرە زیاد دەبن. ئەم شێوازی زۆر بوونە هاوشێوەیە لەگەڵ چۆنیەتی کەرت بوون و زیاد بوونی خانەکان، بە گوێرەی بیروڕای زانایانی پەرەسەندن، خانە سەرەتاییەکە یان ئەمیباکە بەهۆی ئەم دابەش بوونەیەوە گیانداری تری لێ دروست بووەو پەرەی سەندووە. بەڵام ئێمە باسمان کرد یەك ئەمیبا کەرت دەبێت و دەبێتە دوو دانە. ئایا زانست و ژیری و عەقڵ ئەوە قبوڵ دەکەن کە ئەم دوو دانە یەکێکیان گەشە بکات و گیاندارەکانی لێ دروست بێ و ببێتە باپیرە گەورەیان، بەڵام ئەویتر ڕووەکەکانی لێ دروست بێ لەکاتێك دا هەردوو خانەکە یان هەردوو ئەمیباکە لە ڕووی پێکهاتەو فرمان و سیفاتە بۆماوەییەکانەوە زەرڕەیەك جیاوازیان نییە؟،

یـاخود بـا بڵـێین هـەردوو ئەمیباکـە یـان هـەر دوو خانەکـە گـۆڕان بـۆ گیاندار، بێگومـان لـەم بـارەدا ژیـان نـەدەماو سـەرجەم گیانـداران دەمـردن، چـونکە ئۆکسـجین نـەدەماو تـەواوی بەرگـە هەواکـەی زەوی دەبـووە دوانۆکسـیدی کـاربۆن چـونکە ڕووەك نـەخولقاوە تـاوەکو دوانۆکسـیدی کاربۆن هەڵمژێ و ئۆکسجین بداتەوە.

یان ئەگەر ڕامان وابێ هەردوو خانەکە یان هەردوو ئەمیباکە گۆڕان بـۆ ڕووەك، لێرەشدا مەحاڵە ژیانی ڕووەك بـەردەوام بـێ چونکە لـەم بارەشـدا گازی دوانۆکسیدی کاربۆن نەدەما بەهۆی نەبوونی گیانـداران و ڕوونـەدانی کرداری هەوا گۆڕکێ.. بە ڕاستی ئەمە گەورەترین بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە لـە سـەرەتادا گیانـداران و ڕووەکـەکان بەیەکـەوەو هەریەکـەیان بـە سـەربەخۆیی لـە یـەك کـات دا دروسـتکراون تـاوەکو تەواوکـەری ژیـانی یەکتری بن.

* لـە سـەرەنجام دا بـەوە گەیشـتین کـە ئەگـەر چـەندەها لێکۆڵینـەوەی زانستی لە بواری ژیانناسی و خانەزانیدا ئەنجام بدرێت، ئەنجامەکـەی هـەر ئەوەیە کە مەحاڵە ژیان لە ئەنجامی پەرەسەندنی خانـە دروسـت بووبێـت، هەروەك زانای پەرەسەندنی ڕووسی (ئۆپارین) ئـەم ڕاسـتییە دەردەخـات و دەڵێت: **(بە ڕاستی بابەتی چۆنیەتی دەرکـەوتن و دروسـت بـوونی یەکـەم خانە، تاریکترین خاڵە لە بیردۆزی پەرەسەندن دا)..**

سـەرەڕای ئـەو هـەموو تاقیکردنـەوەو بـیردۆزە ڕووخاوانـەی کـە هـەوڵی زانینی بنچینەی ژیانیان دەداو لـە پـاش هـەرەس هێنـانی بـیروڕا زانسـتی و فەلسـەفیەکانی پەیوەسـت بـە بابـەتی سـەرەتای ژیـان، زانـا ماددیـەکان لـە سەدەی نۆزدەدا بیردۆزێکی تریان خستە ڕوو بۆ لێکدانـەوەو شـیکردنەوەی

سەرەتای ژیان کە ئەویش بریتی بوو لە فکرەی (**دروست بوونی خۆیی- التولد التلقائي**)،

لە فەلسەفەی ماددییەت دا بیروڕای (**لە دایك بوونی خۆیی یان دروست بوونی خۆیی**) بە گەورەترین ڕوکنی ڕێبازەکەیان دادەنرێ کە بە ڕای ئەوان لێکدانەوەیەکی گونجاو بۆ سەرەتای ژیان دەکات، بەڵام زانا بانگەوازکارەکانی ئەم بیردۆزە، هەرگیز نەیانتوانی بە بەڵگەی زانستی بیسەلمێنن، بەڵکو بیروڕاکانی ئەم تیۆرە زۆر بە ئاسانی شکستی هێنا بەرامبەر تاقیکردنەوە بایۆلۆجیەکانی سەدەی بیستەم.

بەپێی لێکدانەوەکانی ئەم بیردۆزە، ژیان لە ماددەی نازیندوو دروست بووە. داهێنەرانی ئەم تیۆرە ڕایان وایە کە لەسەرەتادا چەند ماددەیەکی نازیندوو بە (ڕێکەوت) کۆبوونەتەوە سەریەك و کارلێکیان کردووە تاوەکو ماددەیەکی ئەندامی زیندوو لەم ماددە نازیندووانە دروست بووەو ئەو ماددە زیندووەش بۆتە زیندەوەرێکی سادەو سەرەتایی کە هیچ ئەندامێکی بیستن و بینین و هەستەکانی تری نەبووە، بەڵام دواتر بەرەبەرە بەهۆی هۆکارەکانی پەرەسەندن گۆڕاوەو پەرەی سەندووە تاوەکو ئەندامەکانی لەشی پەیدا کردووەو گیانداری تری لێوە دروست بووە.

کەواتە ماددە سەرچاوەو ئەساسی ژیانە بەپێی بیروڕا ماددیەکان و پوختەی بیروڕاکانیشیان ئەوەیە کە دەیانووت ماددە نائەندامییەکان بەچەند قۆناغێکی پەرەسەندن، گۆڕان بۆ ماددەی ئەندامی و لەمەوە بۆ یەکەم جار ژیانی ئەندامی سەرەتایی سەری هەڵدا. ماددییەکان دەڵێن هەروەکو چۆن ئێمە دەتوانین تەنێکی ئەندامی بەهۆی (شی کردنەوە)

هەڵوەشێنینەوەو بیکەینــە چــەند بەشـێکی نائەنـدامی، هــەر بــەم جـۆرە ماددە نائەندامییەکان گۆڕاون بۆ ماددەی ئەندامی.

هەروەها مارکسیەکان دەڵێن ماددەی بێ گیان و مردوو تاکە سەرچاوەی دروست بـوونی ژیانـەو وا لێـك دەدەنــەوە کـە سروشـتی زینـدوو (مـرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەك)، لە سروشتی مـردوو (شاخ دەریـا و دۆڵ و ئـاو و خـاك و خـۆڵ و هتـد) دروسـت بـووە. فەلسـەفە ماددیەکـەی (هێگـڵ) ڕای وایــە کەبوونەوەر هەر هەمووی ماددەیەو بێ گیانە. لـەو ماددەیـەوە بوونـەوەرە زیندووەکان و ماددە بێ گیانەکان دروست بوون و بـەڕای ئـەو بـەهێزترین جوولـە لـە ژیانـدا بریتییـە لـە پەرمسـەندن و گۆڕان. هێگڵ ڕای وایـە کـە گیانــداران و ڕووەك و مــرۆڤ و مــاددە بــێ گیانــەکانیش لـەڕووی دروسـت بوونەوە لە یەك خانەوە پەیدا بوون و یەك سەرەتای هاوبەشیان هەیە.

پوختـەی بیروبـاوەڕی دروسـت بـوونی ژیـان بـە دروسـت بـوونی خـۆیی لـەلای هێگڵ و ئەوانـەی کـە بانگەشـەی ئـەم بـیردۆزە دەکـەن، بـە حـەوت قۆناغ ڕوون کراوەتەوە کە دەڵێن:.

★ لە سەرەتادا ژیانی ئەندامی بە شاردراوەیی لە نێـو مـاددەی زینـدووی ســەرەتایی وەکــو (پرۆتــۆپلازم) دا هــەبوو کــە ئــەو مــاددە زینـــدووە پێکهاتەیــەکی کیمــایی مــڵ بــووەو مــاددەی زولال و ئــاو گــەورەترین پێکهاتەکانی بووە...

★ جوولـەی ئـەو مـاددە زینـدووە کـە پێـی دەوتـرێ (ژیـانی ئەنـدامی)، سروشتێکی کیمیایی هەبووەو هیچ هێزێـك کـاری تێنـەکردووە، تـەنها ئـەو هێزە نەبێت کە لە درزێکی دیـاریکراو کـار لـە ماددەکـە دەکـات و نایـەڵێت (ببەستێت یان بکوڵێت)...

★ ئەگەر پلەی گەرمی ماددەکە لە ئاستی ئاسایی خۆی لایدا بە بەرز بوونەوە بەرەو کوڵان یان نزم بوونەوە بەرەو بەستان، ئەوا مەحاڵە کە ژیان لەو ماددەدا بمێنێ و بە ماوەیەکی کورت لەناو دەچێت...

★ ئەگەر ڕاست بێت کە گۆی زەوی لە خۆر جیا بۆتەوەو چەندینساڵیشی خایاندبێ تاوەکو شل بۆتەوە و پلەیەکی گەرمی گونجاوی وەرگرتووە، ئەوا هەرگیز مادده زیندووەکە (پرۆتۆپلازم) بە درێژایی ئەو ماوە سەخت و دژوارە توانای مانەوەی نەبووە لە ژیاندا، ئەگەر واش بێت، ئەوا هەرگیز ناتوانین بڵێین ـ ژیان هەر بووەو و هەر دەبێت ـ (الحیاة ازلیة ابدیة)...

★ ئەو مادده زولالیە، توانای پەیداکردنی ژیانی نەبوو تەنها پاش دابەزینی پلەی گەرمییەکەی لە پلەی کوڵان...

★ پێکهاتە کیمیاویەکانی ئەو مادده زولالیەی کە ژیانی لێ دروستبوو، بەرە بەرە گەشەی کردوو گۆڕانی بەسەر داهات تاوەکو گەیشتە قۆناغی پرۆتۆپلازم...

★ لەو ماددەیەوە یەکەم زیندەوەر دروست بوو کە پێکهاتەیەکی ئەندامی هەبوو، هەروەها لە ڕووی پێکهاتەو ئەندامە جەستەییەکانەوە سادەو نارێك بوو، پاشان بەرە بەرە پەرەی سەندو گۆڕا بۆ گیانداری تر...

ئەمەیە مێژووی ژیان لە ڕووانگەی فەلسەفە ماددییەکەی هێگڵ و لایەنگرانی کە هەر لەگەڵ تێگەیشتنمان لەم بیروڕایانە یەکسەر ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە تاکە مەبەستی مادده پەرستەکان لەم فکرەیەدا سڕینەوەی خوایە لە مێشکی مرۆڤەکان، بەڵام با ئەو ڕاستییە باش بزانین کە ئەم بیردۆزە بۆنی ڕاستی لێ نایەت و بیرێکی زۆر نازانستی و

نامەنتیقی بوو کە بە مێشکی فەیلەسووفە ماددییەکان و زانایانی بواری ژیاننـاسـی داهـات. ئەگـەر (دروسـت بـوونی خـۆیی) ڕاسـت بووایـە ئـەوا بێگومـان مـرۆڤ ئـەمرۆ بەئاسـانی دەیتـوانی پێشـبینی دروسـت بـوونی زیندەوەری نەبینراوو نامۆ بکات لەو هەموو ماددە نازیندووەی سەر زەوی لەخۆیەوە. ئێستا من نموونەیەکت دەخەمە بەردەم و خۆت بڕیاری لەسەر بـدە. کاتێـك لقـی دارێـك دەشـکێت و دەکەوێتـە نـاو دەریـا، ئـەم لقـە دارە لەگەڵ ئەوەی کە خۆی پێکهاتەیـەکی ئەنـدامی بـووە، شێداری و چەندین ماددەی تری ئەندامی و کیمیاویی لـە ئاوەکـە وەردەگـرێ، بۆچـی ئـەم لقـە ناگۆڕێ بۆ مارێکی بچووك؟ ئەگەر توانیت پێشبینی گۆڕانی بکەیت دەبێت بەڵگەی زانستیت لابێت، ئەگەر ناتوانیت پێشبینی بکەیت دەی بیردۆزێـك کـە لەگـەڵ جیهـانی خـەیاڵ نـەگونجێت چـۆن دەکـرێ بێتـە نێـو جیهـانی ڕاستەقینەکان ..

تاکـە هۆکـاری سـەر هەڵـدانی ئـەم بـیردۆزە (دروسـت بـوونی خـۆیی) بینـیـنی هەنـدێ لـە دیـاردە ڕوواڵەتیـەکان بـوو کـە هێشـتا زانسـت نەگەیشتبووە ئەو ئاستەی کە لە ڕووە ڕاستەقینەکەی ئەم دیاردانـە بگـات. بۆ نموونە کاتێك زانایان دەیان بینی کە گۆشتی بۆگەن لەخۆیـەوە کرمـی لەسـەر دروسـت دەبێـت، یـاخود پەیـدابوونی زینـدەوەری بچـووك لـەنێو خۆراکە تێکچووە فرێ دراوەکان و چەندان دیاردەی تـری لـەم جۆرە، وای لەم زانایانە کرد کە بانگەشەی دروست بـوونی خـۆیی بکـەن. بـەڵام زانـای بـەناوبانگی بـایۆلۆجی فەرەنسـی (لـویس پاسـتۆر)، تـوانی کۆتـایی بـەم سـیناریۆیە بهێنێـت و لێکدانەوەیـەکی ڕاسـت و سـەرکەوتوو بخاتـە ڕوو لـەبارەی ئـەو زیندەوەرانـەی کـە لەسـەر گۆشـت وخۆراکـە تێکچـووەکان دەردەکەون. (لویس پاستۆر) ترسناکترین زەبری لەم فکرەیە دا کاتێـك بـە

بەلگــەی تاقیگــەیی گەیشــتە ئــەو ئەنجامــەی کــە مــێش و مێرووەکــان هەڵدەستن بە گواستنەوەی هێلکەی ووردی بەچاو نەبینراو بۆ سەر گۆشت و خۆراکە بۆگەن بووەکان و پاش ماوەیەك ئەو هێلکانە دەترووکێن و ئەو کرمانە پەیدا دەبن. هەروەها سەلماندی کە زینــدەوەری زیندوو، تــەنها لــە زیندەوەری زیندووی جۆری خۆی دروست دەبێت. ئەنجامــەکانی (لــویس پاســتۆر) بــووە هــۆی سەرســوڕمان و سەرسـام بــوونی ماددییــەکانی ئــەو ســەردەمە چــونکە یــەکێك لــە گــەورەترین بیروڕاکــانی ئــەوان داڕووخــا بەرامبەر تاقیکردنەوەکانی (پاستۆر).

ئێستا ئێمە وەکو یارییەك با وا دابنێین کە ژیان لەماددەی نازیندووەوە بە (دروست بوونی خۆیی) دروست بووە. ئێستا ئێمە بۆ چەند چرکەیەك لایــەنگری ئــەم بیروبــاوەڕەین. بــەڵا بۆچــی پرســیارێکی کوشــندە یەخــەمان دەگرێت و دەڵێت ئەگەر ژیان لە مــاددەوە دروســت بــووە ئــەی ماددەکــە لــە کــوێ هــاتووە؟ لایــەنگرانی ئــەم فکرەیــە زۆر بەکوێرانــە هاتوونەتــە ســەر خــوانێکی ئامــادەو دەڵــێن مــاددە سەرچاوەی ژیانــە، بــەڵام ئایــا سەرچــاوەی ماددەکــە چــییە؟ بێگومــان ماددییــەکان هــەرگیز لــەم یارییــەدا پاشەکشــە ناکەن چونکە ڕێکەوتیان بە دەستەوەیە (الصدفة). زاناکانی ماددییــەت و پەرەسەندن لە ئاست ئەم پرسیارانەدا تەنها ڕێکەوتیان هەیە کە پەنای بۆ دەبەن بۆ پڕکردنەوەی کەلێنەکانیان هەروەك کەپیاوی نابینا تەنها دەست بۆ گۆچان دەبات...

بێگومــان بــیروڕای دروســت بــوونی یەکــەم مــاددە بــەهۆی ڕێکــەوت وەك ئــەوە وایــە کــە بینایــەك لەســەر لێــواری دۆڵێکــی قــووڵ بینــا کرابــێ و بــە بچووکتریت کارتیاکەر دابڕووخێ و ڕووبچێتە ناو قوڵایی دۆڵەکــەو ســەقف و بناغەی تێکەڵی یەکتر ببێت چونکە ڕێکەوت شتێکی خەیاڵی یەو بــوونی

نییە، هەر شتێکیش کە بوونی نەبێ و بانگەشەی بۆ بکرێت دەبێتە خورافیات، خورافیاتیش هەرگیز ناکرێ ڕاستەقینەی زانستی پێ لێک بدرێتەوە.

ئێستا ئێمە با بەراوردێك لە نێوان (ڕێکەوت ) و (مرۆڤ) بکەین بۆ ئەوەی بزانین کە ڕێکەوت شتێکی چەندە ناڕاست و دوور لە عەقڵە...

★ مرۆڤ زیرەکترین و باڵاترین بوونەوەرە تاکو ئێستا کە لەسەر گۆی زەوی بینرابێ. جیاکەرەوەکانی مرۆڤ لە ئاژەڵانی تر لە ژماردن نایەت ومرۆڤ خاوەنی سیفاتی وایە کە هیچ گیاندارێك تەنانەت مەیمونە باڵاکانیش هەستیان بەلاوە ناچێت. مرۆڤ لەکاتی بینینی دیاردەیەکی ئاڵۆز عەقڵێکی ئەوەندە خێرای هەیە کە ڕەنگە بەچەند چرکەیەك چەندەها بیرکردنەوەی ئاڵۆز شی بکاتەوە. هەروەها تەنها مرۆڤە کە دەتوانێت بە زمان قسە بکات و توانای قسەکردن و ناولێنانی شتەکانی هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نهێنییەك هەر دەمێنێ کە مرۆڤ لە بەرامبەریدا دەوەستێ و چۆك دادەدات، ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ توانای داهێنان و دروست کردنی (نوسخەی ئەسڵی) هیچ شتێکی نییە لەم سروشتەدا. بەڵکو داهێنانەکانی تەنها لاسایی کردنەوەی سروشتە. واتە دەبێت نموونەیەك بەبەر چاوی مرۆڤەوە هەبێت تاوەکو لاسایی بکاتەوەو داهێنانەکەی خۆی لەسەر بنیات بنێت. بۆ نموونە پێشکەوتووترین جۆرەکانی فڕۆکە، وەکو ئامێرێکی سادە وایە بەرامبەر چۆلەکەیەکی بچووکی نێو ئەم سروشتە. یاخود ئامێری هەڵکۆڵەر (الحفارة) بەبێ جیاوازی لاسایی کردنەوەی باسکی مرۆڤە. تەنانەت جوومگەی مەچەك و ئەنیشك و دوو ئێسکەکەی باسکیشی لە ئاسن بۆ دروست کراوە، بەڵام مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت نوسخەی ئەسڵی شتەکە دروست بکات تەنها (نوسخەی تەقلیدی) نەبێت.

مــرۆڤ هــەرگیز بــەو هــەموو زیرەکییــەوە ناتوانێــت مرۆڤێکــی ئەســڵی دروست بکات بەڵکو لە ڕێگەی ڕۆبۆتەکانەوە لاسایی دەکاتەوە.

باشە ئەگەر مرۆڤ بەو عەقڵ و زیرەکییە گەورەیە نەتوانێت خانەیەك یــان پرۆتینێــك دروســت بکــات ئــەی چــۆن بــاوەڕ دەکــرێ کــە ڕێکــەوت (الصدفة)، دروستکاری ئەو هەموو بوونــەوەرە ئــاڵۆزە بێــت لــە کاتێکــدا کــە ڕێکەوت بەتاڵە لە هێزو هەست و شــعور و تــەنها ووشــەیەکی خــەیاڵی یــەو هەر بوونیشی نییە. چەندە شەرمەزارییە بۆ مــرۆڤ کە ڕێکــەوتی خــەیاڵی بە دروستکاری ژیان بزانێت و بەخۆشی بەو عەقڵە گەورەیــەوە نــەتوانێت خانەیەك دروست بکات.

فکرەی دروست بوونی خۆیی و ماددییــەتی ژیــان تــەنها بــریتی بــوو لــە هــەوڵێك بــۆ پڕکردنــەوەی کــەلێنێکی گــەورەی تیــۆرە ماددییــەکان چونکە بــەپێی ئــەم فکرەیــە ژیــان پێویســتی بــەخوا نییــە بــۆ دروســت بــوونی و ئەمەش گەورەترین مەبەست و ئامانجی ماددییەکانە.

★ لەبەرئــەوەی فەلســەفە زانســتێکی گشــتگیرو پــەرش و بڵــاوەو بــەرەو گشــت لایــەك پــەل دەهاوێــژێت، بۆیــە زۆر جــار فەیلەســووفان و زانایــان دەکەونــە نێــو داوی خورافیــات و بانگەشــەی شــتی وادەکــەن کــە لەبــەردەم ئاوێنــەی گشــت عەقڵێکــدا پڕوپووچــەو پێویســت ناکــا بــە بەڵگــە لــەدژی بوەســتین چــونکە بــە ئاشــکرایی هەڵەیــەو عــەقڵی مــرۆڤ قبــوڵی ناکــات. فەیلەسووفێکی فەڕەنسی بــەناوی (برجستۆن) بیروبــاوەڕێکی زۆر ســەیری هــەبوو لــەبارەی بابــەتی بنچینــەی ژیــان، ئــەم فەیلەســووفە ڕای وابــوو کــە ژیــان بــریتی یــە لــە توخمێــك یــان شــتێکی تــر کــە ســەربەخۆیەو جیــاوازە

لەگەڵ جەستە، واتا ژیان شتێکی سەربەخۆی نەبینراوەو دەچێتە ناو جەستەو ژیانی وەبەر دەهێنێ!!

بەپێ خەیاڵاتی ئەم فکرەیە ڕەنگە ڕۆژێك دابێت کە ژیان و جەستە لێك جیاببنەوەو گیانداران بەبێ جەستە بژین!، ئەمە هاوشێوەیە لەگەڵ فکرەکەی (ئەفلاتۆن) کە دەیووت ڕەنگی سپی پێش هەبوونی شتە سپی یەکان هەبووەو ئەم ڕەنگە چۆتە ناو شتەکان و وای لێکردوون کەسپی بن!...

★ سەرجەم ئەو ئەفکارو بیردۆزانەی کە بەدرێژایی مێژوو بە مەبەستی دۆزینەوەی نهێنی و سەرەداوی ژیان داڕێژراون و داهێنراون، هەرگیز نەیان توانیوە سەرکەوتن بەدەست بهێنن لە دیاریکردنی یەکەم خاڵی دەست پێکردنی ژیان، ئەو بیردۆزانەی کە لە سەدەی نۆزدەدا باسیان لێوە دەکرا، زیاتر سیمایەکی ماددییان پێوە دیاربوو بەجۆرێك کە ئەم تیۆرانە هیچ بناغەیەکی زانستیان نەبوو، بەڵکو تەنها لەسەر ئەساسی خەیاڵ و دەمارگیری و ئیلحاد دامەزرابوون و هەرگیز بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی دانەهێنرابوون، بەڵکو زۆر بەڕاشکاوانە ببوونە خزمەتکاری بەر قاپیەی کۆشکی ڕێبازەکانی ماددەسالاری وەکو شیوعیەت و سەهیۆنیەت و مارکسیەت و عەلمانیەت و سۆشیالیزم و کۆمۆنیزم..

پەرمسەندنی ژیان لە ماددە کە هەندێك وای بۆ دەچن یان لە خانە، عەقیدەیەکی زۆر هەڵەو پڕوپووچەو لە تەرازووی عەقڵ و مەنتیقدا هیچ کێشی نییە، چونکە ئەم بیردۆزانە تەنها متمانە دەکەنە سەر ماددەو جەستەو هیچ بایەخێك بە لایەنی ڕووحی نادەن. غەریزەو دیاردە ڕوحیەکان لەم بیردۆزانەدا بە تەواوی فەرامۆش کراوە لەکاتێکدا کە

هەڵسوکەوت و ڕەفتارە ڕوحیەکانی گیانـدار، زۆر سـەیرترو سەرسوڕهێنەر ترە لە پێکهاتە ماددییەکەی جەستەکەی. لـە مرۆڤـدا چـەندان غـەریزەی ڕوحی وەکو سۆزو خۆشەویستی و شەرم و ترسـان و زیرەکـی و تووڕەبـوون و چەندانی تر هـەن کـە چۆنیەتی دروسـت بـوونی ئەمانـە زۆر سـەخت و دژوارتـرە لەچۆنیەتی دروستبوونی جەستەکەی. ئەگەر ڕاست بێ کـە ژیـان لـە مـاددەوە یـان لـە خانـەوە دروسـت بـووە، دەی چۆن مـاددەی ڕەق و بـێ هۆش غەریزەی خۆشەویستی و تـرس وشەرم و چەندانی تری وەرگرتـووە؟ بێگومان لە مرۆڤدا ڕوح بەڕێوەبەری ئەو غەریزانەیەو زانا ماددیـەکانیش دەیانزانی کـە غـەریزەو ڕەفتـارە ڕوحیـەکان هـەردەم دەبنـە بەڵگـە لەسـەر هێـزی خـوا بۆیـە ڕەتیـان دەکـردەوەو فەرامۆشـیان دەکـرد، چـونکە تاکـە مەبەسـت و نامـانجی ئـەوان و ڕێبازەکانیـان ئـەوەبوو کـە خـوا لەمێشـکی مرۆڤـەکان بسـڕنەوە... سـەرەڕای ئـەو هـەموو بـیردۆزو ئایـدیا فەلسـەفی و زانستیانەی کە پەیوەست بوون بەبابـەتی بنچینەی ژیـان و بـە مەبەسـتی لێکدانەوەو دیاریکردنی سەرەتای دەرکەوتنی ژیـان داڕێـژرابوون، بەرامبـەر هـەموو ئەمانـە و بـەر لـە هـەموویان بیردۆزێکـی تـر هـەبوو کـە ڕەگێکـی پتەوی لە عەقڵ و نـاخ و بـیری خەڵکیـدا داکوتیبـوو کـە ئـەویش بـیردۆزی (دروست کردنی سەربەخۆ) بوو (الخلق المستقل).. ئـەم بـیردۆزە لـە چاخـە دێرینەکانەوە لەلایەن ئایینـە ئاسمانیەکانـەوە خرایـە ڕوو کـە بـەپێی ئـەم بـیردۆزە بابـەتی پەرەسـەندن و دروسـت بـوونی ژیـان لەخانـە یـان لەهـەر شتێکی تر، شتێکە بە تـەواوی دژی ئـایین و خـوا دەوەسـتێ.. ئـەم بـیردۆزە دەڵێت (لە هەر جۆرێکی گیانـدار، جووتێکی نێـرو مـێ بـە سـەربەخۆیی دروسـت کـراوە لـە لایـەن خـوای گـەورەوەو ژیـان لـەم جووتـەوە دەسـتی پێکردووە)، زاناکانی پەرەسەندن هەرگیز بڕوایـان بـەم بـیردۆزە نـەدەهێنا

چونکە بەڕای ئەوان شوێن کەوتنی دەقەکانی ئایین بریتییـە لـە دواکـەوتن و تەنازول کـردن بەرامبـەر خورافیـات، بـەڵام زۆر لایـان ئاسایی بـوو بـڕوا بکەن کە ژیان لە تەنێکی ماددی نازیندووی بێهۆش دروست بـووە! ئـەوە چ پێشکەوتنێکە کـە ڕامـان وابـێ ئـەو هـەموو زینـدەوەرو گیانـەوەرو مرۆڤـە زیرەکـەی ئـەمڕۆ بـریتین لـە ئـەوەی تـەنێکی مـردووی نێـو زەلکاوەکـانی سەردەمی دەیناسورەکان؟!.

نهـێنی دەرکـەوتنی بیروبـاوەڕی پەرەســەندن لــەوە دابــوو کــە زانــا ماددییەکان و زاناکانی پەرەسەندن تەنها عەقڵی خۆیان دەکردە پێوانـە بـۆ ڕوون کردنـــەوەی بابەتـــەکان، واتـــە ئەگـــەر شـــتێك لەگـــەڵ عـــەقڵیان نەگونجابایـە هـەرگیز بڕوایـان پـێ نـەدەهێناو تـەنها ئیمانیـان بەوشـتانە هـــەبوو کـــە لەگـــەڵ عـــەقڵیان دەگونجـــا، دروســـتکردنی گیانـــداران بەسـەربەخۆیی لەلایـەن خـواوە هـەرگیز نەدەچـووە عـەقڵیان و دەیـانووت چۆن عەقڵ ئەوە قبوڵ دەکات کە لە سەردەمێکدا گۆی زەوی چۆڵ بێـت و کەسی لەسەر نەبێت، دواتر یەکسەر لەهەر جۆرێکدا جـووتێکی نێـرو مـێ بێتە کایـەوە، بـەڵام بانـەوە بـاش بـزانین کـە عـەقڵی مـرۆڤ توانـای زانـینی هـــەموو نهێنییـــەکانی نییـــەو نابێتـــە پێوانـــە بـــۆ هەڵســـەنگاندنی ڕاستەقینەکان،

زۆر ســەیرە کـە لایـەنگرانی پەرەســەندن عــەقڵیان قبــوڵ ناکـات کـە دەسـەڵاتی خـوا هـەموو گیانـداران لـە یـەك کاتـدا بەسـەربەخۆیی دروسـت بکـات، بـەڵام عـەقڵی ئـەوان چـۆن ئـەوە قبـوڵ دەکـات کـە لـە سـەردەمێکدا تــەنها چــۆلەکە لەســەر زەوی هــەبێت و پــاش چــەندەها ســەدە ئینجــا کەروێشـك دەرکــەوتبێ و دوای چــەندین ســەدەی تــریش، ســەگ دروســت بووبێت و ئینجا مـامزو بـزن و بـەرازو مـەیموون و ئینجـا دروسـت بـوونی

مرۆڤ لە مەیموونەکان! ئەمە چ عەقڵێکە کە دەیەوێت ئەو داستانە خەیاڵیانە بهێنێتە نێو جیهانی ڕاستەقینەکان، ئەوە چ عەقڵێکە کە ئەم شتانەی لەگەڵ دەگونجێ...

بیردۆزی (دروست کردنی سەربەخۆ) فکرەیەکی زۆر ساف و پەسندەو بە ڕای من لێکدانەوەکانی سەد لە سەد ڕاستەو گومانی تێدا نییە، چونکە بابەتی دروست بوونی ژیان شتێکی زۆر ئاڵۆزەو چەندەها کێشەو ئارێشەی دژوار دێنە بەردەم کرداری دروست بوونی ژیان، بارە ژینگەییەکانی سەردەمی سەرەتای زەوی زۆر سەخت و ناهەموار بوون بۆ دروست بوونی ژیان، بۆیە هەموو ئەو کێشەو ئاستەنگانە پێویستیان بە کەسێکی بەهێزو بێ وێنە هەیە تاوەکو چارەسەری ئەم کێشانە بکات و زاڵ بێت بەسەر ئاستەنگەکان، ئێمە لەم بەشەدا توانیمان سەرجەم ئەم بیردۆزانە پووچەڵ بکەینەوە کە باسی بنچینەی ژیانیان دەکردو توانیمان کەموکوڕی و ئاستەنگەکانی ئەم بیردۆزانە بە ئاسانی بدەینە بەر تیری ڕەخنەی زانستی و ڕەتیان بکەینەوە، باشە چۆن ئەمەمان بۆ کرا؟ بێگومان لەبەر ئەوە توانیمان، چونکە ئەم تیۆرانە چەندین ناهەمواری و کەموکوڕییان دێتە پێش بەڵام هەرگیز باسی توانای خوا ناکەن بۆ زاڵ بوون بەسەر ناهەمواریيەکان.. (إسماعیل مظهر) کە وەرگێڕی کتێبەکەی داروینە بۆ سەر زمانی عەرەبی، لە پێشەکی کتێبی (أصل الأنواع) دا دان بەم ڕاستییەدا دەنێت و دەڵێت:

(ئەگەر وامان دانا کە ژیان لە ئەنجامی تێکەڵ بوونی توخمە سەرەتاییەکانەوە دروست بووە، ئەوا هەرگیز بۆمان ناکرێ ئینکاری ئەو هێزە بە توانایە بکەین، کە ئەو توخمانەی بە زنجیرەیەك گۆڕان و پەرەسەندن دا تێپەڕاندووە تا گەیشتۆتە ئاستێك، کە ژیانی لێوە بڵاو

**بۆتــەوە. ئــەو زنجــیرە گۆڕانــەی کــە هــیچ یاســایەکی کیمیــایی یــان هــیچ ئامێرێك سەری لێ دەرناچێت.)**

دوورخســتنەوەی خــوا لــە مرۆڤــەکان کارەســاتێکی زۆر گــەورە دروســت دەکات لەسەر عەقڵ و بـیری مـرۆڤ، چـونکە ئەوکاتـە مـرۆڤ دەکەوێتـە نـاو بازنـــەی خـــەیاڵ و هـــەردەم بیردەکاتـــەوەو خـــۆی وا دێتـــە بەرچـــاو کـــە بوونەوەرێکی بێ خاوەنە لەم سروشـتەدا، مـرۆڤ بوونـەوەرێکی زۆر لاوازەو پێویستی بە خاوەنێك هەیە تاوەکو ئاراستەی کارەساتەکانی لێ لابدات...

من هەرگیز نـاتوانم ئیمـان بـە پەرەسـەندن بهێـنم، چـونکە ئەگـەر مـن بڕوام وابێ کە سەرجەم بوونـەوەران لە تەنێکەوە دروست بوون و پـەرەیان سەندووە، ئەوا گشت مرۆڤەکان بەبـەر چاومەوە ڕێزیـان نـامێنێ و لەهـەر کاتێکـدا مرۆڤێـك ببیـنم وادەزانم تـەنێکی ماددییـە بەبـەر چـاومەوە یـان خانەیەکە، پەرەسەندن مرۆڤایەتی لە مـرۆڤ دەسێنێتەوەو لەگـەڵ ئاژەڵان یەکسـانی دەکـات. نووســەری عــەرەبی بــانگخوازی پەرەســەندن (**سـلامة موسی**) لـە کتـێبی (**نظریـة التطـور و أصـل الإنسـان**) بـە ڕاشـکاوی پـەردە لەســەر ئــەم ســاختەکارییانەی پەرەســەندن لادەدات و دەڵێـت (**مامۆسـتا لەپۆلـدا دەبێــت وا لەقەلــەم بــدات کــە ئــەو قوتابیانــەی لەبەردەمیــدا دانیشـتوون، هـەموویان بەچـکە مـەیموونن!**) هـەروەها لەشـوێنێکی تـردا، زیاتر شانازی بەئاژەڵێتی خۆی دەکات و دەڵێت زۆر ئاساییە ئەگـەر مـن بـە دۆستەکەم بگەم و پێی بڵێم (**ماسی برام!**)، ئەمەیە کارەساتی پەرەسـەندن کـە مرۆڤایــەتی لــە مــرۆڤ دادەماڵێــت و دەیکاتــە ئــاژەڵێکی بــێ خــاوەن و بێگومان ئەمەش گەورەترین کارەساتە بۆ مرۆڤ.

بیردۆزی دروست کردنی سەربەخۆ لە ناحیەی فکرییەوە زۆر گونجاوە لەگەڵ عەقڵ و بیری مرۆڤ چونکە بەگوێرەی ئەم بیردۆزە، ئاژەڵ وەکو ئاژەڵ سەیری دەکرێ و مرۆڤیش وەکو مرۆڤ. کەواتە ئەگەر کەسێك ئیمانی بەم بیردۆزە هەبێت ئەو کاتە ڕێزو نرخی مرۆڤ بەبەر چاوییەوە زۆر بەرز دەبێت، چونکە مرۆڤی وادێتە بەر چاو کە دروستکراوێکی سەربەخۆیەو لاشەو غەریزەکانی تایبەتمەندە بە مرۆڤایەتی نەك لە ئاژەڵانەوە پەرەی سەندبێ. هەروەها ئەم بیردۆزە وەنەبێت هیچ بەڵگەی لەسەر نەبێت و تەنها بیروڕایەکی ئایینی بێت بەڵکو چینە جیۆلۆجیەکان بەڕوونی پاڵپشتی ئەم بیردۆزە دەکەن و ڕاستیەکانی دەسەلێنن، چونکە تائێستا کۆنترین گیانداری بەبەردبوو کە دۆزرابێتەوە بریتییە لەو بەبەردبووانەی کە لە چینی (کامبری) دا دۆزراونەتەوە کە بەبەردبووی هەر هەموو جۆرەکانی گیاندارانی بە سەربەخۆیی تێدا دۆزراوەتەوە، کەواتە گشت بوونەوەران لە سەرەتادا بە سەربەخۆیی هەبوون.. زانایانی پەرەسەندن هەر لەبەر ئەوە بانگەشەی پەرەسەندن و گۆڕانی گیاندارانیان دەکرد لەجۆرێکەوە بۆجۆرێکی تر، چونکە لەنێوان جۆرەکانی گیاندارانـدا لێکچوونی بەهێزیان بەدی دەکرد، بۆ نموونە لەیەکچوونی سیفاتە غەریزی و لاشەییەکانی مرۆڤ و مەیموون، وای لە زانایانی پەرەسەندن کرد کە بڵێن مرۆڤ لە مەیموونەوە پەرەی سەندووە، بەڵام ئەمە هەرگیز وانییە، چونکە بە تەنها لێکچوون هەرگیز نابێتە بەڵگە بۆ ئەوەی ئەم دووانە یەك شت بن، بەڵکو هەموو شتێك لەم گەردوونەدا سەربەخۆیە..ئێستا بانموونەیەك باس بکەین بۆ ئەوەی بزانین کە ئایا لێکچوونی دووشت مانای ئەوە دەدات کە ئەم دووانە پێشتر یەك شت بوون و لێك جیابوونەتەوە؟ (گەردەکان) هەر بەچاویش

نابینرێن، کەچی لەناویاندا چەندین ئەلیکترۆن لەسەر ڕێڕەوێکی بازنەیی بەدەوری ناوکەکەیدا دەخولێنەوە، بێگومان ئەمە لێکچوونێکی بەهێزە لەگەڵ سوڕانەوەی هەسارەکان بەدەوری خۆر، بەڵام ئایا دەکرێ بووترێ سیستەمی کۆمەڵەی خۆر لە گەردەکانەوە پەرەی سەندووەو دروست بووە؟ بێگومان نەخێر، چونکە کۆمەڵەی خۆر شتێکی سەربەخۆیەو گەردەکانیش شتێکی سەربەخۆن، کەواتە لێرەدا لێکچوونەکان هەرگیز نابنە بەلگە بۆ پەرەسەندن و بەم پێیە مرۆڤ و مەیموونیش هیچ پەیوەندییەکیان بە یەکەوە نییەو هەریەکەیان سەربەخۆن با لەیەکیش بچن... سەرجەم ئەو بیروڕایانەی کە سەرەتای دروستبوونی ژیانیان دەگێڕایەوە بۆ کاریگەری پەرەسەندن بە تەواوی ڕەت کراونەتەوە لەلایەن کتێبە پیرۆزەکانی ئایینە ئاسمانیەکان و ئەم کتێبانە زۆر بە ڕاشکاوی ئەوە ڕادەگەیەنن کە سەرجەم بوونەوەران هەریەکەیان بە سەربەخۆیی دروستکراون، کاتێك دیراسەی قورئان و تەورات دەکەین تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەم دوو کتێبە بە درێژایی مێژوو دوو بانگەوازکاری جیهانی بوون بۆ ئەوەی وا لە خەڵك بگەیەنن کە گشت بوونەوەران لەلایەن خواوە بە سەربەخۆیی دروستکراون دوور لە پەرەسەندن، لە (سفر التکوین) ی تەورات و ئینجیلدا زۆر بەڕوونی باسی ئەوە کراوە کە گشت جۆرەکانی گیانداران و مرۆڤ بە سەربەخۆیی لە نەبوونەوە دروستکراون و بابەتی پەرەسەندن و گۆڕان یەك ووشەی لێ باس نەکراوە لەم کتێبانەدا، لە تەوراتدا بابەتی دروستبوونی ژیان بەم شێوەیە هاتووە کە دەڵێت:

(خوای گەورە فەرمانی کردو گوتی با دەریاکان پڕ بن لە گیانداری خاوەن نەفسی زیندوو، هەروەها با لە ئاسماندا باڵندەی هەمەجۆر دروست

**بـبن و بفـڕن، دوای ئەمـە خـوای گـەورە ماسـی و نەهەنگـە گـەورەکانی دروسـت کـردو هـەروەها باڵنـدەکانیش، پاشـان هـەر بـەم جـۆرە گشـت گیاندارەکانی تری دروست کرد، دواتر خوا گوتی با ئێستا مـرۆڤ دروست بکـەم و ئـەو مرۆڤـە بـا دەسـت بگرێـت بەسـەر هـەموو گیانـدارە دروستکراوەکانی سەر زەوی)...**

بـەڵام ئێسـتا بـا ئـەوە بـزانین کـە (**قورئـان**) چـەندە پسـپۆرانە دژی پەرەسـەندن دەوەسـتێ و زۆر بـە سـەیری باسـی دروسـتکردنی سـەربەخۆ دەکات، بێگومان ئەگەر ڕاست بێت کە مـرۆڤ لـە مەیموونەکانـەوە پـەرەی سەندووە، ئەوە دەبێت لە ڕۆژگارێکدا مرۆڤ دروست بوونی خۆی بە چاوی خـۆی دیـتبێ، چـونکە ئەگـەر مـەیموون گـۆڕابێ بـۆ مـرۆڤ بێگومـان لـە سـەرەتادا یەکـەم مـرۆڤ دەبێـت نیـوەی مـرۆڤ بووبێـت و نیوەکـەی تـری مـەیموون، کەواتـە مـرۆڤ بینیویـەتی کـە چـۆن دەسـت و قاچـەکانی لـە مەیموونەوە گۆڕاون بۆ مرۆڤ، جا ئەگـەر ئەمـە ڕاسـت بێـت، دەبێـت مـرۆڤ دروستبوونی خۆی بەچاو دیتبێ و شاهیدی خـەلقی خـۆی بووبێـت. بـەڵام (**قورئان**) زۆر بە ڕاشکاوی ئەم شتە ڕەت دەکاتەوە کە لە دەقێکی ئاشـکرادا خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ﴾. **الكهف -٥١-**

واتـە مـن هـەرگیز کـرداری دروسـت کردنـی ئاسمانـەکان و زەویـم بـە مرۆڤـەکان نیشـان نـەداوەو نـەمکردوون بـە شـاهید، هـەروەها چـۆنیەتی دروستکردنی خۆشیانم پێ نیشان نەداون...

## سەرەنجام

بابــەتی چــۆنیەتی دروســت بــوونی ژیــان، دەبێــت بگەڕێنرێتــەوە بــۆ دەســەڵاتی خــوا، بەپێچەوانەوە ئەگەر ملیۆنــەها ئــەفکارو تیــۆری زانســتی لــەنێو کەوانــەکانی بیردۆزناســیدا بخەینــە ســەر لاپــەڕەکانی فەلســەفەو سەرجەم کتێـب و لاپـەڕەکانمانی پـێ پـڕ بکەینـەوە، ئـەوا هـەر دەگەینـەوە هەمان خاڵ و هەرگیز ناتوانین پێناسەیەکی ڕاستەقینە بۆ سـەرەتای ژیـان دابڕێژین و دەبێـت بەناچاری ئـەو دان پیانانـەی (جیفـری بـادا) ی زانـای پسپۆری کیمیـایی قبـوڵ بکـەین کاتێـك گوتی: (ئێمـە وا سـەدەی بیسـتەم بـەجێ دەهێڵین، کەچـی هـەروەك ئـەوە وایـن کـە لـە سـەرەتای سـەدەی بیستەم دا بین کـە گـەورەترین کێشـە ڕوو بـەڕوومان دەبێتـەوە، ئـەویش ئەوەیە ئایا ژیان چۆن دروست بووە؟)

# پێناسەی ژیان

ژیــان چــەندە ڕووێکــی تــەم و مــژاوی و نادیــاری هەیــە کــە هــەر لــە ســەردەمی ســەرەتای دەرکــەوتنی فەلســەفەکانەوە تــاوەکو ئێســتا بــە تێپــەڕ بوونی ملیارەها ملیــار ساڵ، هــەرگیز مرۆڤێــك نــەیتوانیوە پێناســەیەکی وا بۆ ژیان بخاتە ڕوو کە تێنوێتی گشت لایەك بشکێنێت و بابــەتی بنچینەی ژیان بە تەواوی ببڕێنێتەوە، بەڵام ئێستا من چی بڵێم لەبارەی ژیــان، ژیــان فەیلەسووفێکی ئەوەندە پڕ نهێنییە وەك ئەوەی بڵێی کە:

ژیــان ئەنــدازیارە.. ســەیرترین نەخشــەی کێشــاوە بــۆ ڕاکێشــان و دامەزراندن و سوڕاندنەوەی مولولــەو دەمــارە خوێنبــەرەکان بــەناو لەشدا، بە جۆرێك کە سەرجەم ئەندامەکانی لەش خوێنیان لــێ نــەبڕێت و پاشــان هــەمان خــوێن تەســلیمی خوێنهێنــەرەکان دەکاتــەوەو بــە ئەندازەیــەکی سەیرتر بەرەو هەمان شوێنی دەگەڕێنێتەوە...

ژیان مێژوونووسە.. مێژووەکەی خۆی بــەڕوونی و ئاشکرایی بەدەستی خــۆی نوســیوەتەوە لــەنێو چــینەکانی گــۆی زەویــدا. لاپــەڕە کۆنــە بەردینییەکانی مێژووی خۆی، بەتەواوی خستۆتە بەر دەستی مرۆڤ بەڵام تاوەکو ئێستا مــرۆڤ تــەنها یــەك لاپــەڕەی لــەم مێــژووە هەڵداوەتــەوەو ئــەو لاپەڕەیەشی شێواندو دەستکاری کرد...

ژیــان مامۆســتایە... و بوونــەوەرانیش قوتابیــانی ئــەون، بــە گرمــەی هەورەتریشقە بەســەریان دا هاواردەکــات و بــە بریســکەی بروســك قامچی

ڕادەوەشێنێت و سەریان شۆڕدەکات بەرامبەر ئەو خالقەی کە ئەگەر ئەو بوونی نەبوایە ئەوان پێشی ئەو، بوونیان نەدەبوو...

ژیان هونەرمەندە.. چەندین ڕەنگی سەیرو جوان بە تەنیشت یەکەوە ڕیز دەکات بێ ئەوەی تێکەڵی یەکتر ببن، پاشان دەیان چەمێنێتەوەو هەموویان بە یەکسانی دەکاتە قەوس و پەلکەزێڕینەیان لێ دروست دەکات...

ژیان برین پێچە.. توێکڵ و قەپاغ لەسەر دەمی برینەکان دروست دەکات و خوێنی لێ ڕادەگرێت بەبێ ئەوەی بریندار هەستی پێ بکات، بەڵام ماددە ئەم بەهرەیەی هەرگیز نییە.

ژیان دڵ ڕەق و بێ بەزەییە... بەچکەی ئاسك بە بەرچاوی دایکییەوە، دەخاتە بەر کەڵبەو نینۆکە تیژەکانی پڵنگ و پڵنگیش فێردەکات کە جەستەی ئەم ئاسکە ناسکە بە زیندوویێتی پەل پەل بکات بە بەر چاوی دایکییەوە. هەروەها کوشندەترین ژەهر دەخاتە دەمی مار و ددانەکانیشی هەردەم بۆ تیژ دەکاتەوە تاوەکو بەئاسانی بتوانێت کارە سەختەکەی ئەنجام بدات...

ژیان زۆر دڵ نەرم و بە بەزەییە... ددانەکانی منداڵی ساوا لە شەش ساڵی دا دەجوولێنێت بێ ئەوەی هەستی پێ بکات، دواتر لێی دەکاتەوە بە بێ ئەوەی ئازاری بدات، بە جۆرێك کە منداڵەکە حەزدەکات کارەکە دووبارە بێتەوە تاوەکو شیرینی ئەم بەزەییە دووبارە بچێژێتەوە ...

ژیان فەرمانبەرە... فەرمانبەرێکی پیرەو تەمەنی بەسەر چووە، دەیەوێت داوای خانەنشین بوون لە بەڕێوبەرەکەی بکات، بەڵام ترس و هەیبەتی بەڕێوەبەرەکەی ناچاری دەکات کە بەردەوام بێت لە خزمەت کردنی ئەوانەی کە هێشتا وادەی ژیانیان ماوە...

**ژیان پەیکەرتاشە...** پەیکەری گیانداران ملیارەها ساڵ پێش ئێستای لەشێوەی گیاندارانی بەبەردبوو بۆمان تاشیوەو لەنێو چینەکانی زەوی دا هەڵی گرتووە تاوەکو بە ئێمەی نیشان بدات، بۆئەوەی هیچ بیانوویەکمان نەبێت بەسەر ژیانەوە....

**ژیان ماددەیە..** بەڵام بۆچی کێشی نییە! ڕەنگی نییە! بۆنی نییە! قەبارەی نییە! بارستایی نییە! کەواتە نەخێر هەرگیز ژیان ماددە نییە....

**ژیان پاشایە...** لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە. فەرمان دەدا و بڕیار دەردەکات، یەك فەرمانی گەر بشکێنرێ سزای تاوانبار مردنە و ژیانی لێ وەردەگرێتەوە. بەڵام ئەگەر لێی بپرسیت چۆن هاتویتە سەر ئەم تەختە نازانێت و بێ دەنگ دەبێ و هەرگیز وەڵامی لا نییە....

**ژیان پزیشکە...** پزیشکێکی دەرمانساز، دەرمان دەگرێتەوە بێ ئەوەی پێویستی بە هیچ ماددەیەکی کیمیایی و ئەندامی هەبێت. لەنێو سکی هەنگ دا دەرمان دەگرێتەوەو لەشێوەی هەنگوین دەری دەدات، نەخۆشەکان ئەم دەرمانەی لێ وەردەگرن، بەڵام ئەوە کێ یە و چ پزیشکێکە نە خۆی و نە تاقیگەکەی دیارنین و دەرناکەون....

**ژیان پسپۆری کیمیاییە...** کاتێك خۆراك دەچێتە گەدە، ترشی هایدرۆکلۆریکی بەسەردا دەکات و بە زنجیرەیەك کارلێکی کیمیاییدا تێیدەپەڕێنێت و تا لە ئەنجامدا هەڵی دەوەشێنێتەوەو بەرەو کرداری هەرسی دەنێرێت....

**ژیان سەربازە...** لەبەر دەرگای کۆشکی لاشەی گیانداراندا ڕاوەستاوەو پاسەوانە، پرۆتینی دژەتەن دەخاتە ناو خوێن و ڕاوی میکرۆبی پێ دەکات....

★ ئەمانــەی ووتم... چــەندەهای تــریش... کــە هێشــتا مــاون... بــەس خــەیاڵ بــوون... دوور لــە ڕاســتی... بــەڵام ئێســتا... ڕاســتەقینە ... بــا بدرکێنم...

**ژیـان بەندەیـە..** بەنـدەی خـوا، هـیچ فـەرمانی بـە دەسـت نییـەو هـیچ بڕیـاری لـەلا نییـە، بـەڵکو بەندەیـەو بـە بڕیـاری خـوا کـار دەکـات، ژیـان بەڵگەیە لەسەر هێزی ئەو خوایـەی کـە ژیـان بەندەیـەتی و ژیـان بەنـدەی ئەو خوایەیە کە هەموو ژیانێك دەمرێنێت و بایەخ نـادات بـەوەی کـە ئایـا ئەم ژیانە ڕازییە بە مردن یـا نـا.. کەواتـە ژیـان بەندەیـەکی دروسـتکراوی خزمەتکارە، خزمەتی ویستی خالقەکەی دەکـات و بـۆ سـەلماندنی خوایـەتی خوا دروست کراوە.....

# بەشی حەوتەم

# بنچینەو ڕەچەڵەکی مرۆڤ

دیاریکردنی بنچینەی مرۆڤ و لەکوێوە هاتنی، بابەتێکە هیچی کەمتر نییە لە کێشەی زانینی سەرەتای ژیان، مرۆڤ بەحوکمی ئەوەی کە بە هێزترین و زیرەکترین عەقڵی هەیە لەسەر ئەم زەوییەدا، بۆیە دەبێت لە کاتی توێژینەوەی زانستیمان لەبارەی ڕەچەڵەك و سەرەتاکەیدا، زۆر ووشیار و هەستیار بین بەجۆرێك کە پێویستە وا بیر بکەینەوە کە ئێمە توێژینەوە لەبارەی کائینێکی زۆر پیرۆز و باڵا دەکەین، چونکە هەڵەیەکی زۆر گەورەیە ئەگەر مرۆڤ یەکسان بکەین لەگەڵ ئاژەڵان، لەبەر ئەوەی مرۆڤ چەندەها نهێنی زۆر سەیرو سەمەرەی هەمەجۆری تێدا بەدی دەکرێ کە هەر بەم نهێنیانەیە مرۆڤ توانیویەتی لەسەر زەوی دا دەسەڵات لە بەهێزترین دروستکراوەکانی تریش وەربگرێتەوەو خۆی بکاتە سوڵتانی سەر زەوی. لە بابەتی دۆزینەوەی ڕەچەڵەك و بنچینەی مرۆڤدا تا ئێستا لە مێژووی فەلسەفە و ئاییندا سێ ڕێگا گیراوەتە بەر بۆ توێژینەوە لە ڕەچەڵەکی مرۆڤ یەکێکیان ئەو بیروڕایەیە کە ڕەچەڵەکی مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە بۆ سەر ئاژەڵانی پێش خۆی و ڕای وایە کە مرۆڤ بریتیە لە سەرەنجامی چەند گۆڕان و پەرەسەندنێك کە لەدێر زەمانەوە بەسەر جۆرەکانی گیانداراندا هاتووەو گیانداران هەر جۆرێکیان گۆڕاون بۆ

جۆرێکی تـر تـا لـە ئەنجامـدا دواقۆنـاغی ئـاژەڵێتی بـە مـەیموون کۆتـایی هـاتووە و سـەرەتای مرۆڤایـەتی لـەم مەیموونانـەوە دەسـتی پێکـردووە، دووەمیان باوەڕی دروستبوونی سەربەخۆیە کە ئەمەیان بانگەوازی ئایینـە ئاسمانیەکانەو دەڵێت مرۆڤ یەکسەر بە سەربەخۆیی و بێ جیاوازی لەسەر ئەم شێوەیە دروست کراوە کە ئێستا لەسەریەتی، ئـەم بـاوەڕە مـرۆڤ بـە دروسـتکراوێکی سـەربەخۆی بەردەسـتی خـودا دەزانێـت و بەتونـدی دژی ئەوەیە کە مرۆڤ بنچینەو ڕەچەڵەکەکەی بگەڕێنرێتەوە بۆ سەر ئـاژەڵانی پێش خۆی. بەگوێرەی ئەم بیروباوەڕە، مرۆڤ هـەرگیز پـەرەی نەسـەندووە لە گیانداری ترو هەرگیز پەرەناسەنێت بۆ هیچ کائینێکی تر بەڵکو یەکەم مرۆڤ کە بـە (ئـادەم) ناسـراوە هـیچ جیاوازیـەکی نـەبووە لەگـەڵ مرۆڤـی ئـەمڕۆ، بـەپێی ئـەم بیروبـاوەڕە، پەرەسـەندن هـیچ مانایـەکی نییـە بـەڵکو یەکەم مرۆڤ یەکسەر لە خۆڵ و ڕوح دروست بووە تەنها بە یـەك فـەرمانی خوا.....

بیروڕای سێیەمیان، زیاتر کەسانێك باسی لێوە دەکـەن کـە هـەوڵ دەدەن ئینکاری هیچ یەکێك لە دوو باوەڕەکەی پێشوو نەکەن، واتـە دەیانـەوێت میانڕەو بن لەنێوان هـەردوو باوەڕەکـەو لـە یـەك کاتـدا ئیمانیـان بـە هـەر دوو لا هەیە. ئەمانە دەڵێن ڕاستە مرۆڤ لەلایەن خواوە دروستکراوە، بـەڵام ویسـتی خـوا لەسـەر ئـەوە بـووە کـەمرۆڤ لەسـەرەنجامی چـەند پەرەسەندنێکی گیانـدارانی پـێش خۆیـەوە دروست بێـت بۆئـەوەی بەسـەر هەموویانەوە ڕێز و پلـە و پایـەی هـەبێت و ببێتـە لووتکەی پەرەسـەندن. کەواتە هی سێیەمیان ڕای وایە کە خوا ڕێگـەی پەرەسـەندنی گرتۆتـە بـەر لـە کـرداری دروسـتکردنی بوونـەوەران و سـەرجەم ئـاژەڵانی بـە گـۆڕان و پەرەسندن دا تێپەڕاندووە تاوەکو لە کۆتاییدا مرۆڤی لێ دروست کـردووە.

ئەم بیروڕایە هەوڵ دەدات هیچ لایەك برینـدار نـەكات و ڕای وایـە لەگـەڵ ئیمان بە دەسـەڵاتی خـوا، توخمـە ئەساسـییەكانی گـۆی زەوی لـە سـەرەتادا شـتێكی وایـان لـێ دروسـت بـووە كـە ژیـانی تێـدا هـەبێت. دواتـر ئـەم زینـدەوەرە گـۆڕاوەو گەشـەی كـردووە قۆنـاغ بـە قۆنـاغ، تـا گەیشـتۆتە لووتكەی كۆتـایی پەرەسـەندن كـە هەرچـی عـەقل و زیرەكـی نـاوازە هەیـە بەخشیویەتیە ئەم كائینە كە لە دوا قۆناغی پەرەسەندن دا دروست بووەو ناوی ناوە مرۆڤ...

ئەگەر ئێمە ڕای یەكەم وەربگرین كـە ڕەچـەڵەكی مـرۆڤ دەگەڕێنێتـەوە بۆ دەرەنجامی پەرەسەندنی ئاژەڵانی پـێش خـۆی، ئـەوە دەبێـت دوو خـاڵی زۆر گـرنگ لەبـەر چـاو بگـرین، یەكـەمیان ئەوەیـە كـە ئایـا چـۆن و بەكاریگەری چ شتێك ئەندامەكانی جەستەی مـرۆڤ بـەم شـێواز و ئەنـدازە ڕێك و پێك و بێ وێنەیە هەڵكەوت؟

ئەندامەكانی جەستەی مرۆڤ زۆر بە سەرسوڕهێنەری هەریەكـەیان بـە قـالبی خـۆی دروسـت كـراوەو لەشـوێنی گونجـاوی خـۆی دانـراوە كـە تـەواو جیاوازە لەگەڵ چۆنیەتی هەڵكەوتنی ئەندامەكانی لەشی گیانـداران، مـرۆڤ بـە ئەندامـە سەرسـوڕهێنەرەكانی لاشـەی، توانـای ئـەنجام دانـی جوولـەو كاروبـاری وا سـەیری هەیـە كـە مەحاڵـە زیـرەكترین گیانـداریش شـتی وا بتوانێـت. ڕەنگـە گیانـدارە گـەورەكانی وەكـو فیـل و ئەسـپ و ووشـترو چەندانی تـر، كەللەی سـەرو دەماغیـان زۆر لـە هـی مـرۆڤ گـەورەتر بێـت بەڵام لەبەر نـەگونجاوی دەسـت و قاچـەكانی هـەرگیز ناتوانێـت بچوكترین شـت بەدەسـت بگرێـت، كەچـی مـرۆڤ ئەنـدازەی دەسـت و پەنجـەكانی وا هەڵكـەوتووە كـە هەرچـی بیـەوێت لـە گـەورەو بچـووك بـە دەسـت هـەڵی

دەگرێ و چەندەها ئامێری هەمەجۆری سەیرو سەمەرە دروست دەکات و بەکاری دەهێنێت بەدەستەکانی، ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ و ئەندازە ناوازەکەی گەورەترین جیاکەرەوەی مرۆڤە لە ئاژەڵان و بەربەستێکی زۆر گەورەیە لە بەردەم پەرەسەندن، چونکە جەستەی مرۆڤ سەد لەسەد جیاوازە لەگەڵ هی ئاژەڵان و شتێکی ئەوەندە ئاسان نییە بۆ زانست کە یەکسەر بڵێت مرۆڤ لەئاژەڵانەوە پەرەی سەندووە، دواتر پەرەسەندن و گۆڕانی ئەندامەکانی لەش کارێکی وا ئاسان نییە کە کاتێکی کەمی بوێت، بەڵکو بۆ دروست بوون و پەرەسەندنی تەنها یەك پەنجە لەدەستی گیاندارێکدا، ملیارەها ملیار ساڵ دەخایەنێت. ڕەنگە ئێستا بپرسیت ئەی بۆچی زۆرجار لەناکاو منداڵی وا لەدایك دەبێت کە شەش پەنجە بەدەستەکانیەوە دروست بوون؟ بێگومان ئەمە پەرەسەندن نییەو ناشبێتە بەڵگە لەسەر پەرەسەندن، چونکە ئەم حاڵەتە بریتیە لە لادان و شێوانی کرۆمۆسۆمەکان و هەروەك چۆن بە کاتێکی زۆر کەم دەرکەوت ئاواش بەکاتێکی زۆر کەمتر نامێنێت کە لەکاتی هاوسەرگیری کەسەکە منداڵەکانی دێنەوە سەر شێوە ئاساییەکەی جاران و پێنج پەنجەیان دەبێت. ئەگەر ئەم حاڵەتە پەرەسەندن بوایە، ئەوە دەبوایە تا هەتایە هەر هەموو مرۆڤەکان شەش پەنجەیان هەبوایە، چونکە پەرەسەندن بانگەشەی دروست بوونی جۆری نوێ دەکات بە هۆی گۆڕانی ئەندامەکانی لەش. بێگومان بۆ پەرەسەندن و گۆڕانی یەك ئەندامی لەش لە جۆرێکەوە یان لە شێوازێکەوە بۆ شێوازێکی تر، دەبێت ملیارەها ساڵ زیاتریش بۆ ئەم کارە تەرخان بکرێت. لە مۆزەخانەیەکی شاری نیویۆرکی ئەمریکی کە تایبەتە بەمێژووی ژیان و سروشت، پەیکەری ئەسپێك دانراوە کە سێ پەنجەی هەیەو قەبارەی بچوکترە لە ئەسپی ئێستا، سروشتناسانی ئەم

مۆزەخانەیـە دەڵێن گومانمـان لـەوەدا نییـە کـە ئـەم گیانـدارە کـاتی خـۆی ئەسپ بووە و هەروەها ڕایان وایە کە ئەم ئەسپە گۆڕاوەو بـە پەرەسـەندن ئەو ئەسـپەی ئێسـتای لـێ دروسـت بـووە کـە ژمـارەی پەنجـەکانی زیـاترە و قەبارەی گەورەترە...

بەڵام لە هەمان کاتدا هەر خۆیان دەڵێن ئـەو ئەسـپە بچووکە ملیارەها سـاڵ، بـەڵکو زۆر زیاتریشـی خایانـدووە تـاوەکو گـۆڕاوە بـۆ ئـەم ئەسـپەی ئێستا. ئەمە تەنها گۆڕانی قەبارەی ئەسپێك بوو لە بچوکەکەوە بۆ گـەورە، کە ملیارەها ساڵی دەوێت ئـەی ئەگـەر مـەیموونێك بـە کـاملی جەسـتەکەی بگۆڕێ بۆ مرۆڤ دەبێت چ کاتێکی خەیاڵی بوێت، ئێسـتابا لێکۆڵینەوەیـەکی گریمانی ئەنجام بدەین لە بارەی چاخەکانی پەرەسەنـدن بۆ ئـەوەی بـزانین کە ئایا ئەو کاتەی پەرەسەندن دەیخایەنێت گونجاوە لەگـەڵ تەمـەنی گـۆی زەوی؟!.

★ لە لێکۆڵینەوەکەماندا با بەراوردێك لـە نێـوان جەسـتەی مـەیموون و مـرۆڤ بکـەین بۆئـەوەی تیشـکێك بخەینـە سـەر ئـەو کاتـە خایـانراوەی کـە سـەرجەم گیانـدارانی تێـدا بـە پەرەسـەندن تێپـەڕیوە تـاوەکو گەیشـتۆتە قۆنـاغی دروست بوونی مرۆڤ. لێرەدا دەمەوێت کاتێکی گریمـانی بـە نزیـك کراوەیـی بخەمــە ڕوو لــە نێــوان یەکــەم زینــدەوەر کــە هەنــدێك دەڵــێن ئەمیبایە، تاوەکو دروستبوونـی کۆتا بوونەوەر کە مرۆڤە......

پەنجە گەورەی دەسـتی مـەیموون (الإبهـام) زۆر کـورت تـرە لـە پەنجـە گەورەکەی دەستی مرۆڤ، بـە جۆرێـك کـە ئەمـە دیـارترین جیـاوازی نێـوان مرۆڤ و مەیموونە، ئێستا ئەگەر وا دابنـێین کـە مـرۆڤ لـە مەیموونەکانـەوە پـەرەی سـەندووە، بێگومـان دەبێـت ئـەوە ڕەچـاو بکـەین کـە ئایـا پەنجـە

گەورەی دەستی مەیمون چەند ساڵی ویستووە بۆ ئەوەی بگۆڕێت و باریک و درێژ بێت تاوەکو پەنجە گەورەی دەستی مرۆڤی لێ دروست بێت، گریمان دوو ملیۆن ساڵی دەوێت بەلایەنی کەم، چونکە تا ئێستا ملیارەها ساڵە مرۆڤ بوونی هەیە کەچی پەنجەیەکی نەگۆڕاوەو زیادو کەمی نەکردووە بەڵام ئێمە بە لایەنی کەم وەکو گریمانێك دوو ملیۆن ساڵ دادەنێین بۆ کرداری گۆڕانی پەنجە گەورەی مەیموون بۆ هی مرۆڤ .

هەروەها مەیموون لە ڕووی زۆری موو لەسەر جەستەیەوە هەموو پێستی بە موو داپۆشراوەو لەم ڕووەوە هەروەك ئاژەڵانی تر وایە، بەڵام لەشی مرۆڤ لە ڕووی چڕی مووەوە زۆر بە کەمی چەند موویێکی لاوەکی تێدا ڕوواوەو ئەمەش بە تەواوی پێچەوانەی لاشەی مەیموونە. گریمان لێرەشدا پێستی مەیموون دوو ملیۆن ساڵی خایاند بۆ ئەوەی وەك هی مرۆڤ مووی بەسەرەوە نەمێنێ......

لێرەدا تەنها بۆ ئەم دوو کردارە چوار ملیۆن ساڵ، هەروەها گریمان عەقلی مەیموون بە دوو ملیۆن ساڵ پەرەی سەندو گۆڕا تاوەکو ئەو عەقلە بەهێزەی مرۆڤی لێ دروست بێت، ئەوە شەش ملیۆن ساڵ. هەروەها هەروەك دەبینین مەیموون بڕبڕەی پشتی چەماوەیە و ناتوانێت ڕاست ڕابوەستێ بە پێچەوانەوەی مرۆڤ، ئەگەر بە دوو ملیۆن ساڵیش پشتی ڕاست بووبێ و بە دوو ملیۆن ساڵیش کلکی لەسەر پشتی نەمابێت، ئەوا دەگاتە (١٠) ملیۆن ساڵ. بێگومان ئەو (١٠) ملیۆن ساڵەی کە دەرمان هێنا، تەنها لێکدانەوەیەکی گریمانی بوو ئەگەر نا کاتێکی زۆر لەمە زیاتریشی دەوێت. ئێستا لێرەدا تەنها گۆڕانی جۆرێك بۆ جۆرێکی تر (١٠) ملیۆن ساڵی بوێت بە لایەنی کەم، ئەی باشە دەبێت ئەو هەزارەها جۆرە

گیاندارەی پێش ئەوان چەند ملیارەها ملیـار سـاڵی بوێـت بـۆ ئـەوەی هـەر یەکێکیان بگۆڕێت بۆ یەکێکی تر. ئەگەر هەڵسین بـە ژمـاردنی جۆرەکـانی گیانداران لە ئەمیباوە کە سادەترینیانە تـاوەکو مـرۆڤ، بێگومـان هـەزارەها جـۆری گیانـدار دەژمێـرین کـە ئەگـەر وا دابنـێین ئـەم هـەموو جـۆرە لـە یەکتریەوە دروست بوون و پەرەیان سەندووە، ئەوە کاتێکی وای دەوێت کـە گۆی زەوی هەرگیز ئەو تەمەنەی نییە. لەنێوان ئـەمیبا و مرۆڤـدا ڕەنگـە زیـاتر لـە بیسـت هـەزار جـۆری گیانـداری ئـاوی و ووشـکانی و باڵـدارەکان هەبن کە ئەگەر پەرەسەندنی هەر جۆرێکیان بـۆ جـۆرێکی تـر (١٠) ملیـۆن سـاڵی بوێـت، ئـەوا ئەگـەر تـەنها سـەد دانـەیان لـێ وەربگـرین بێگومـان پێویسـتمان بـە (هـەزار) ملیـۆن سـاڵ دەبێـت بـۆ دروسـت بوونیـان بـە پەرەسەندن، ئەمە لە کاتێکدا کە چینە جیۆلۆجییـەکان ئـەوە دەردەخـەن کـە تەمـەنی گـۆی زەوی زۆر لـەوە کـەمترەو تەنانـەت کـۆنترین مێـژووی ڕوودانی تەقینەوە گەورەکەو دروست بـوونی زەوی بـە (٥٠٠) ملیـۆن سـاڵ خـەمڵێنراوە لـە لایـەن زانایـانی بـواری زەوی ناسـی. زانـای زەوی نـاس (تیـاردی شـاردان) لـە سـاڵی ١٩٥٠ز لـە لێکۆڵینەوەیەکـدا لـەبارەی مێـژووی دەرکـەوتنی ژیـان هـەرگیز متمانـەی بـەخۆی نـەبوو کـە یەکـەم خـاڵی گەشەسـەندنی ژیـان بگەڕێنێتـەوە بـۆ (٦٠٠) ملیـۆن سـاڵ پـێش ئێسـتا. تەنانـەت لـەوە سـەیرتر ئەوەیـە کـە هـەردوو زانـای بـواری زانسـتی بەبـــەردبووەکان (پـــۆڵ) لەگـــەڵ (پێڤیتـــۆ) لەســـاڵی ١٩٣٥ز لـــە توێژینەوەیەکیانـدا، نـەیانتوانی کـە سـەرەتای دەسـت پێکـردن و دروسـت بوونی یەکەم چینی جیۆلۆجی بگەڕێننـەوە بۆ (١٠٠) ملیۆن سـاڵ بـەر لـە ئێستا.

بەڵام ئەو نزیك کراوەی کە تا ڕاددەیەك ناوەندە زانستییەکان لەسەری کۆکن لەبارەی مێژووی زەوی، بریتییە لە (٥٠٠) ملیۆن ساڵ کەچی تەنها بۆ پەرەسەندنی سەد جۆری گیاندار ووتمان بە لایەنی کەم هەزار ملیۆن ساڵی دەوێت. بێگومان لە نێوان ئەمیبا و مرۆڤیشدا هەزارەها جۆری گیاندار هەن کەواتە تەمەنی زەوی و ئەوکاتەی کە پەرەسەندن دەیخایەنێت لە ئەمیباوە تا مرۆڤ ئەوەندە لەگەڵ یەکتر جیاواز و لێك دوورن بەجۆرێك کە لە بازنەی عەقل دەردەچێ. ئەگەر واش گریمان بکەین کە مرۆڤ لە ئەنجامی پەرەسەندنی گیاندارانی پێش خۆیەوە دروست بووە ئەوکاتە دەبێت ئەوە بپرسین کە ئەو کەش و هەواو پلەی گەرمیە بکوژو مەترسیدارەی کە لە سەردەمە دێرینەکاندا لەسەر زەوی بوونیان هەبوو، چۆن گونجا بۆ ئەوەی بوونەوەرێکی لاوازی وەکو مرۆڤ لە گیاندارە بەهێزەکان دروست بێت لە کاتێکدا ئەگەر کەش و هەوا سامناك و دژوار بێت تەنها بوونەوەری بەهێز و تواناداروگیانداری بەرگەگری لە ژێر پەروەردە دەبێت نەك بوونەوەرێکی وەکو مرۆڤ کە ئەوەندە لاوازو بێ هێزە ئەگەر پلەی گەرمی بەرز بێتەوە هەر دەمرێ ئەگەر نزمیش بێتەوە هەر دەمرێ. بێگومان لە سەردەمێکدا زۆربەی زۆری ڕووی زەوی بەستەڵەك بووەو پلەی گەرمی لەوپەڕی ساردی دابووەو ئەم سەردەمەش پێی دەوترێ (چاخی بەستەڵەك-العصورالجليدية)، لە چاخی بەستەڵەکدا، لەبەر نزمی و ساردی پلەی گەرمی چەندین گیاندار بنەبڕ بوون لەبەر ئەوەی توانای بەرگە گرتنی ئەو بارە ژینگەییە سەخت و دژوارەیان نەبوو...

بێگومان مرۆڤیش کائینێکی زۆر لاوازو بێ هێزەو لەوچاخە دژوارانەدا هەرگیز توانای ئەوەی نەبوو بەهیچ گۆڕانێکی جەستەیی دا بڕوات بۆ

ئەوەی لە ڕووی جەستەییەوە کامل بێت، کەش و هەوا سەختەکەی ئەو کاتە هەرگیز ڕێگەی نەدەدا بە هاتنە کایەوەی کائینێکی لاوازی وەکو مرۆڤ و نەدەگونجا بۆ ئەوەی بوونەوەرێکی بێ هێز لە گیاندارە بەهێزەکان پەرە بسەنێت..

ئەگەر پەرمسەندن بکرێتە هۆکاری دروست بوونی مرۆڤ ئەوا بێگومان دەبووایە مەیموونەکان بگۆڕابان بۆ گیانداری تری زۆر بەهێز، چونکە ئەم چاخە سارد و سامناکانە گیانداری زۆر بەتوانای دەویست کە خۆی بۆ ڕابگرێت...

لەگەڵ ئەوەی کە سروشتناسان دەڵێن لە چاخی بەستەڵەکدا هەرچی گیانداری بێ هێز هەبوو هەمووی نەماو بنەبڕبوو، بەلام بۆچی لە سەردەمی ئێستادا چەندەها گیانداری لاوازو بێ هێز هەن کە ئەگەر ئەو کاتە هەبوونایە بێگومان بەرگەی ساردییەکەیان نەدەگرت و نەدەمان، بێگومان مرۆڤ نموونەیەکە لەوانە، بەلام بۆچی ئێستا ماون و لەو کاتەدا بنەبڕ نەبوون؟ بێگومان ئەم پرسیارە بەرەو ئەوەمان دەبات کە ڕەنگە بڵێین زۆربەی گیاندارانی ئێستا لەدوای کۆتایی هاتنی چاخی بەستەڵەکەوە پەیدابوون دوور لە پەرمسەندن، ئەمەش ئەم ووتەیەی دروستکاری بوونەوەرانمان دێنێتەوە یاد کەپێشتر ووتبووی ﴿يَزِيدُ فِي الخَلقِ ما يَشاءُ﴾.

هەروەها خاڵێکی تر کە پێویستە لەبەر چاوبگیرێ، ئەویش مەسەلەی گەورەیی و زیرەکی عەقلی مرۆڤە، زیرەکی و بەهێزی دەماغ لە مرۆڤدا تاکە هۆکاری سەرکردەیی مرۆڤە لەسەر ئەم زەوییەدا. پێویستە بپرسین ئەگەر مرۆڤ لە ئاژەڵانەوە پەرەی سەندبێ ئایا عەقلی چ ئاژەڵێك توانای

هەیەو گونجاوە بۆ ئەوەی پەرەبسەنێ و ئەم عەقڵە گەورەیەی مرۆڤی لێ دروست بێت؟ ئایا لە نێو گیاندارانـدا هیچ یەکێکیان هەیە کە لە ڕووی عەقڵییەوە بە کەمترین شت لە مـرۆڤ بچێت؟ بێگومـان نـزیکترین گیانـدار لە مرۆڤەوە بریتییە لە مەیموون کەچی ئەم دووانە سەد لەسەد لە ڕووی عەقڵیـەوە لێـك دوورن و مــەیموون هــەرگیز توانــای عــەقڵی نییــە بۆشیکردنەوە و داهێنان و ڕوونکردنەوەی بابەتەکان، ئەمە لە کاتێکدا کە ئەگەر مـرۆڤ لـە مەیموونـەوە دروست بووبایـە، دەبوایـە بـە لایـەنی کـەم مەیموونـەکان تۆزێـك ڕەفتـاری عـەقڵانیان تیـا بـەدی بکرابایـە، چـونکە ناکرێ مرۆڤێکی وا عاقڵ لە ئاژەڵێکی وا بێتە کایەوە کە تەواو پێچەوانەی یەکتر بن لە ڕووی توانای عەقڵییەوە.....

مرۆڤ نیگا و ئیلهامی زۆر بەهێزە، بـەجۆرێك کـە هـەر شـتێك ببینێت شـتێکی پـێ فێـر دەبێـت، هـەروەها کارەسـات و ڕووداوە سـەختەکانی ژیـان کاریگـەری زۆر بەرچـاویان لەســەر مــرۆڤ هەیـە، چـونکە مـرۆڤ خـاوەنی عــەقڵێکی وایــە کــە ناخۆشــی و ڕووداوەکــانی ژیــان وەکــو قوتابخانــە سەیردەکات و پەندی لێ وەردەگرێ و خۆی تێدا پەروەردە دەکات بـەڵام ئاژەڵ هەرگیز وا نییە، چونکە سنوری عەقڵە تەسك و بێ هێزەکەی تـەنها توانای ئەوەندەی هەیە کە بیر لە خواردن و سەلامەتی ژیانی بکاتەوە.....

ئێستا ئێمە با بگەڕێینەوە بۆ کۆنترین و دوورتـرین مێـژووی سـەردەمی مرۆڤایــەتی کــە ئــەویش ئــەو ســەردەمەیە کــە هێشــتا (ئــاگر) تێیــدا نەدۆزرابووەوەو بوونی نەبوو، بۆئەوەی لـە ڕێگـەی بـەراوردکردنی عـەقڵی مـرۆڤ و ئاژەڵانی ئەوکاتە لەئاستی جیـاوازی نێـوان مـرۆڤ و ئـاژەڵ بگـەین. لــە چــاخە دێرینەکانــدا کاتێــك لەبــەر چــاوی مرۆڤــەوە بڕکانــەکان

دەتەقینەوەو پریشك و بەردی ئاگرییان دەهاویشتە دەرەوە، یاخود کاتێك گەردەلوولی توند (إعصار) ئاگری لە پووش و گژوگیا ووشکەکان بەردەدا، مرۆڤ لە ئاست ئەم ڕووداوانەدا عەقلی خۆی خستەگەڕو هەستی بەوە کرد کە ئەم ئاگرە سوودی بۆی هەیە، بۆیە بە گرنگییەوە دەیپاراست و پەرەی پێ دەدا تاوەکو گەیشتە سەردەمێك کە مرۆڤ تیایدا فێری داهێنان و دروست کردنی ئاگر بوو کە ئەمە بە کۆنترین داهێنانی مرۆڤایەتی دادەنرێ، مرۆڤ لەو کاتەدا، ئەو ئاگرە تازە داهێنراوەی زۆر لا پیرۆز بووەو سەری لێ سورماوە چونکە پێشتر شتی وای نەدیبوو بۆیە کرایە خواوەند و پەرستشی بۆ کرا. مرۆڤ بەهۆی عەقلە بەرزەکەیەوە لە ئەنجامی وورد بوونەوە لەدیاردەکان گەیشتە داهێنانی ئاگرو ئەم ئاگرەشی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکارهێناو توانی بەسەر مەترسییەکانی ئاگردا زاڵ بێت، بەڵام ئاژەڵان وا نەبوون، بەڵکو زۆر بەترسەوە لە ئاگر هەڵدەهاتن و لێی دوور دەکەوتنەوە چونکە عەقڵە بچووك و سنوردارەکەیان هەرگیز لە سوود و زیانەکانی ئاگر نەدەگەیشت و وەکو مرۆڤ نەبوون هەر بۆیە تائێستاش سەرجەم ئاژەڵان تەنانەت زیرەکترین جۆرەکانی مەیموونیش ناوێرن لە ئاگر نزیك بکەونەوەو زۆر بەترسەوە لێی ڕادەکەن....

ئەگەر وا خەیاڵ بکرێ کە مرۆڤ لە ئاژەڵ و مەیموونەکانەوە پەرەی سەندووە، ئەوا بە لایەنی کەم دەبێت لە کۆندا مەیموونەکان تۆزێك توانای بەکارهێنانی ئاگریان هەبووبێت بۆئەوەی ئەم سیفەتە عەقڵیە بەرەبەرە پەرەبسەنێت و مرۆڤ بە پەرەسەندن ئەم بەهرەیەی لێ هەڵبگرێتەوە. چۆن دەگونجێت کە مرۆڤ بە هەموو شێوەیەك ئاگر بەکار بهێنێت و بەسەریدا زاڵ بێت لە کاتێکدا کە باپیرە گەورەکەی واتە (مەیموون) هەرگیز نەوێرێت لە ئاگر نزیك بێتەوە! بێگومان ئەم سیفەتە

عەقلیە وەکو حەڵقەیەکی پچڕاوی نێوان مـرۆڤ و مـەیموون دێتـە بەرچـاو کە بەئاشکرایی لێکیان جیا دەکاتەوە..

هەروەها بابەتێکی تر کە شیاوی ئەوەیە باس بکرێ، ئەوەیە کـە ئەگـەر ڕاست بێت مرۆڤ لە مەیموونەکانەوە دروست بووەو پەرەی سەندووە، ئـەوا بێگومـان دەبێــت لــە ســەردەمێکدا و لەســەرەتای دروســتبوونی مرۆڤــدا هەردووکیان واتە (مرۆڤ و مەیموون)، بەیەکەوە لە یەك ژینگـەدا ژیـابن و زۆر لەیەکچووبن لەڕووی ڕەفتارەکـانی ژیانـەوە.. بـەڵام بۆچـی لـە واقیعـدا ئەمە نایەتە جێ؟ مرۆڤ زۆر زیرەکانە ڕەفتار دەکـات و هۆکارەکـانی ژیـانی زۆر بـە ڕێـك و پێکـی دەڕەخسێنێت و ڕێکـی دەخـات و لـە دابـین کردنـی پێداویسـتیەکانیدا بـەهرەی زۆر جـوانی هەیــە، بــەڵام پێشـکەوتووترین جۆرەکـانی مــەیموونیش، لــەڕووی ڕەفتــار و هەڵسـوکەوتەکانی ژیانــەوە هــەروەك گیانــدارانی تــر وایــەو لــە ڕەخسـاندنی پێداویسـتیەکانی ژیانیـدا هەرگیز لە مرۆڤ ناچێت و ئاژەڵانە ڕەفتار دەکات. ئیستا لێرەدا پرسـیارێك دێتە پێشەوە ئەگەر ڕاسـت بێـت کـە مـرۆڤ و مـەیموون یـەك بنچینەیان هەیە و بە یەکەوەش لە کۆندا لەیەك ژینگەدا ژیاون، ئایا ئـەو هۆکـارە چ بوو کە وای لە مرۆڤ کرد لە مەیموون زیـرەکتر بێـت؟. ئەگـەر وابێـت کـە ئەم دووانـە یـەك بنچینەیان هەیـەو لـە یـەك شـتەوە دروسـت بـوون و لـە یـەك ژینگەشـدا بەیەکـەوە ژیـاون، بۆچـی مەیموونـەکانیش وەکـو مـرۆڤ نەهاتنە ناو ژیانێکی مرۆڤانە؟ یاخود بۆچی مرۆڤەکانیش وەکو مـەیموون نەهاتنەوە ناو ژیانێکی ئاژەڵانە؟

ئەگـەر مرۆڤێـك و مـەیموونێك لـە دورگەیـەکی چـۆڵدا بـەرەڵا بکـەین، دەبیــنین کــە هــەردووکیان لــە ســەرەتادا و هەریــەك بۆخــۆی هــەوڵی

دۆزینــەوەی خانوویــك یــان ئەشــكەوتێك دەدات بۆئــەوەی تێیــدا بــژیت و هــەروەها هــەردووكیان لــە كــاتی برســێتیدا ڕەنگــە لــە بــەروبومی دارەكــان بخۆن، تا ئێستا لە ڕوواڵەتدا ئەمانە وەكو یەك وان، بەڵام دیمەنی ڕوواڵەت هەرگیز نابێتە پێوانــە بــۆ یەكسان بــوونی ئــەم دووانــە، چونكە لــە ڕووی بیركردنەوەو عەقڵەوە ئەم دووانە زۆر جیاوازن و مرۆڤەكە هــەرگیز وەكو مەیموونەكــە وا نییــە، چــونكە كاتێــك مەیموونەكــە بەرهــەمی دارەكــە دەخوات، ئەو عەقڵەی نییە كە بیر بكاتەوە دارەكە ئاو بدات و ڕێكی بخات و پــەرەی پــێ بــدات بــەڵكو بــە شــێوەیەكی كــاتی خــۆی لــێ تێــر دەكــات و بەجێی دەهێڵێ بێگومان ئەمــەش بــە تــەواوی ڕەفتــارێكی ئاژەڵانەیــە، هــەر لەبەر ئەمەشە كە مەیموون عەقڵێكی وای نییە كە بە زیرەكی و كارامــەیی وەكو مرۆڤ هەڵسێت بــە ڕێكخســتن و ڕەخساندنی پێداویستیەكانی ژیــانی چونكە مــەیموون بــە ئــاژەڵێتی خــەلق كــراوە، بێگومــان مرۆڤەكــە وا نییــە بەڵكو مرۆڤ لێــرەدا عــەقڵی دەكەوێتــە كارو هەســت دەكات كــە ژیــانی بــەم دارەوە بەندە، بۆیە بایەخی پێ دەدات و گرنگی پێ دەدات و ڕێكــی دەخــات و نایــەڵێت جــارێكی تــر مەیموونەكــە لێــی نزیــك بێتــەوە. جــا بــەم پێیــە دەبێت مرۆڤ دروستكراوێكی تایبەتی سەربەخۆ بێــت كــە جەســتەكەی بــە شــێوەیەك دروســتكراوە كــە توانــای هــەڵگرتن و بــەكارهێنانی ئــەم عەقڵــە گەورەیەی هەبێت.

ئێمە لێرەدا باسی ڕێك و پێكی ئەندامەكانی لەش و گەورەیی عــەقڵمان كرد لە مرۆڤدا، بەڵام خاسیەتێكی تر لەنێوان ئەم دووانەدا ئەوەیە كەئــەم ئەندازە جوانەی ئەندامەكانی جەستەی مرۆڤ گەورەترین مەرج و هۆكــارە بۆپێشــكەوتنی عــەقڵی مــرۆڤ، ســەرجەم نهێنیــەكانی زیرەكــی و گــەورەیی عەقڵی مرۆڤ لەوە دایە كەمرۆڤ چەندەها تایبەتمەنــدی ســەیر و نــاوازە لــە

پێکهاتە جەستەییەکەیدا نەخشێنراوە بەجۆرێك کە لە هیچ گیاندارێکدا شتی لەم جۆرە نابینرێت تەنانەت لە پێشکەوتووترین جۆری مەیموونەکانیش، ئێستا ئەگەر هەوڵ بدەین چەند جیاوازییەکی جەستەیی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵان دیاری بکەین، دەبینین مرۆڤ بە چەندەها تایبەتمەندی جەستەیی لە گشت ئاژەڵان جیادەبێتەوە کە بەرچاوترین و سەیرترینیان چۆنیەتی دروستبوونی (دەست)ی مرۆڤە. دەستی مرۆڤ بەجۆرێکی زۆر سەرسوڕهێنەر دروستکراوە بەجۆرێك کە گەورەترین فاکتەر بووە بۆ گەورەیی عەقلی مرۆڤ. دەستی مرۆڤ توانای گرتن و هەڵگرتنی هەر هەموو شتێکی هەیەو لەگەڵ هەموو شێوەو قەبارەیەك خۆی دەگونجێنێت و بە چەندەها گۆشەی سەیر دەچەمێتەوە، ئەمەش بەتەواوی پێچەوانەی پێکهاتەی دەستی ئاژەڵانە و لە هەموو جیهاندا گیاندارێك نییە کە لە ڕووی توانا و پێکهاتەی دەستییەوە تۆزێك لە مرۆڤ بچێت، عەقلی مرۆڤ پێویستی بە دەستێکی لەم جۆرە هەبوو بۆ ئەوەی بیرکردنەوەکانی بە شێوەیەکی عەمەلی جێبەجێ بکات و بیانکاتە کردار. دەستی مرۆڤ لەکاتی گرتنی شتەکاندا، زۆر بە سەیری دەجوولێت، لەکاتی داخستنی دەستدا جومگەکانی هەر چوار پەنجە بەرەو ئاراستەی ناو لەپ دەچەمێنەوەو پەنجە گەورەکەش بە درێژییەکی گونجاو بەسەر هەرهەموویاندا دەچەمێنێتەوەو بەم ئەندازە ڕێك و پێکەش هەرچی بیەوێت دەیگرێت و هەموو جۆرە ئامێرێکی گەورەو بچووك بەکار دەهێنێ.. بەڵام دەستی ئەو مەیموونانەی کە تۆزێك لە مرۆڤ دەچن، پەنجە گەورەیان زۆر لە هی مرۆڤ کورت ترەو تەنها توانای گرتنی چەند شتێکی سادەیان هەیە. ئێستا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئەگەر وامان دانا کە دەستی مرۆڤ بە پەرەسەندن دروست بووە، ئایا لە دەستی چ

گیانـداریّك پـەرەی سـەندووە؟ لـە سەرتاسـەری دونیـا ئاژەڵێك نییـە كـە دەستی تۆزێك لە دەستی مرۆڤ بچێت. ئەگەر وابێت كـە دەسـتی مـرۆڤ بـە پەرەسـەندن دروسـت بـووە، بێگومـان دەبوایـە بـەر لـە مـرۆڤ هەنـدێك مەیموون هەبوونایە كە دەستیان ناتەواو بوایە یاخود با بڵێین سێ پەنجە یان چواریان هەبوایە، تـاوەكو بـەرەو كامـل بـوون پەرەبسـەنێت و ببێتـە پێنج پەنجەو ئەم دەستە تەواوەی مرۆڤی لێ دروست بێت!

بـــەڵام تۆمـــاری بەبـــەرد بووەكـــان بەتـــەواوی پێچـــەوانەی ئەمـــەی دەرخســـتووەو تـــا ئێســـتا هـــەر هـــەموو ئـــەو مەیموونانـــەی كـــە لەشـــێوەی بـــەردینی لـــە نێـــو چـــینەكانی زەوی دا دۆزراونەتـــەوە هـــەموویان پێـــنج پەنجـەیان هەیـە و هـیچ جیاوازییـان نییـە لەگـەڵ دەسـتی مەیموونـەكانی ئێستا....

بێگومـان ئەمـە ڕاسـتەقینەیەكە كـە هـەموو لایـەنگرانی پەرەسـەندن دانیـان پیـا نـاوە، ئـەوەتا (سـلامة موسـی) كـە لایـەنگرێكی زۆر تونـدی پەرەسەندنە، بە ئاشكرایی دان بەم ڕاستیەدا دەنێت و دەڵێت (لە چیرۆكی پەرەسەندن دا هیچ شـتێك لـە دەسـتی مـرۆڤ سەرسوڕهێنەرتر نییـە، تـا ئێستا ئێمە نازانین چۆن پەرەی سەندووە!)

هـەروەها پێكهاتـەی (چـاو)ی مـرۆڤ ئەوەنـدە بـە سەرسـوڕهێنەری هەڵكـەوتووە بـەجۆرێك كـە عـەقلی مـرۆڤ پێویسـتی بـەم جـۆرە كامێرایـە بەهێزە هـەبوو بـۆ ئـەوەی وێنـەی دیمەنـەكانی وەك خـۆی بـۆ بگوازێتـەوە تاوەكو عەقل شییان بكاتەوە، چاوی مرۆڤ لە چەند چركەیەكدا دەتوانێت چـەندەها دیمـەن ببینێـت و زۆر بـە توانایـە لـە شـی كردنـەوەو لێـك جیاكردنەوەی ڕەنگەكان، كە ئەمەش بەتـەواوی پێچەوانەی ئـاژەڵانی تـرە

کە چاویان هەرگیز ئەو توانایەی نییە، ئایا دەگرێ چاوی مرۆڤ بە پەرەسەندن دروست بووبێت؟ بێگومان مەحاڵە کە چاوی مرۆڤ لە چاوی هیچ ئاژەڵێکەوە پەرەی سەندبێ چونکە هیچ ئاژەڵێك نییە کە لە کاتی بینینی شتەکاندا وەکو مرۆڤ عەقل بەکاربهێنێت بۆ لێکدانەوەی شتە بینراوەکان، چاوی مرۆڤ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ دەماغ هەیەو هەر لەگەڵ بینینی یەك دیمەن یەکسەر عەقلی دەکەوێتە کار بۆ شیکردنەوەی، بەلاّم لە سەرتاسەری گۆی زەویدا چاوی هیچ ئاژەڵێك توانای بەکارخستنی عەقلی نییە، بێگومان ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئاڵۆزی و ناوازەیی پێکهاتەی چاو لە مرۆڤدا کە پەرەسەندن هەرگیز توانای ڕوون کردنەوەی ئەم ئاڵۆزییانەی نییە. ئەندازەو نەخشەسازییە ئاڵۆزەکانی چاو بە یەکێك لە ئاستەنگە هەرە گەورەکان دادەنرێ لە بەردەم بیردۆزی پەرەسەندن هەروەك دەبینین کە (داروین) بە ڕاشکاوی لە کتێبی (أصل الأنواع) دا، دان بەم ڕاستیەدا دەنێت و دەڵێت:

**(ئەگەر توێژەرێك بانگەشەی ئەوە بکات کە چاو، بەو هەموو تایبەتمەندی و پێکهاتە سەیرەیەوە، لەگەڵ سیستەمی ئەو تیشکۆیەی کە هەیەتی بۆ بینینی مەودا دوورەکان و بڵێت بە هۆی هەڵبژاردنی سروشتییەوە دروست بووە، ئەوە بێگومان قسەکەی لەگەڵ عەقل ناگونجێت!)..** أصل الأنواع،ل٣٤٩

هەروەها سەیرترین تایبەتمەندی لە جەستەی مرۆڤدا ئەوەیە کە تەنها مرۆڤە لەسەرئەم زەوییە کە بالاّکەی ڕاست بێت و لاشەکەی ڕاست و ڕێك هەڵکەوتووەو پشتی نەچەماتەوە، سەرجەم گیانداران لەسەر چوار

قاچ دەڕۆن بەحوکمی ئەوەی کە پشتیان چەماوەیەو سەریان بەرەو زەوی چەماوەتەوە.

گیانداران هەر هەموویان بەردەوام پشتیان چەماوەیەو سەریان بەرز نابێتەوەو ملیان بەرەو زەوی کەچ بووە، بەمەش لە حالەتێکی پەرستش و (رکـوع)ی بـەردەوام دان بەرامبـەر خالقەکـەیان بۆیـە پێویسـت ناکـات عیبادەتیان لەسەر فەرز بکرێت، چونکە شێوازی هەڵکەوتنی جەستەیان هەر خۆی عیبادەتە، بەڵام مرۆڤ باڵاکەی ڕاستەو سەری بەرەو ئاسمان بەرز بۆتەوەو پشتی نەچەماوەتەوە، بۆیە دەبێت بە زەبری فەرمانی ئیلاهی پشتی بچەمێنرێتەوە بۆ پەرستش کردن بەرامبەر خالقەکەی!،

مرۆڤ بۆیە باڵای ڕاستەو سەری بەرەو ئاسمان بەرز بۆتەوە تاوەکو بتوانێت نهێنی و سەیرو سەمەرەکانی ئاسمان و گەردوون و بوونەوەران بە چاو ببینێ، تاوەکو عەقلی خۆی بەکار بهێنی بۆ سەلماندن و ئیعتراف کردن بە خوایەتی خوا، چونکە مرۆڤ عەقلێکی زۆر بەهێزی هەیەو هەرگیز وەکو ئاژەڵان وا نییە. پاش ئەمە چ گومانێك دەمێنێتەوە لەوەی کە مرۆڤ دروستکراوێکی دوور لە پەرەسەندنە؟

بێگومان مرۆڤ بە ڕاستی و ڕێکی باڵاکەی، لە سەرجەم ئاژەڵان جیا دەبێتەوەو ئەم پشت ڕاستییە ئەرکی ڕۆیشتن زۆر ئاسان دەکات بۆ مرۆڤ چونکە گیانداران هەر چوار پەلیان بەکار دەهێنن بۆ ڕۆیشتن بەڵام مرۆڤ دەتوانێت تەنها بە دوو قاچ بڕوات و بوەستێت بەمەش مرۆڤ دوو دەستەکانی بۆ ماوەتەوەو بۆ ڕۆیشتن بەکاریان ناهێنێت، بەڵکو دەستەکانی بۆ کارکردن و داهێنان و دروستکردنی ئامێرو هەڵگرتنی شتەکان بەکار دەهێنێ بێگومان ئەمەش گەورەترین یارمەتیدەر بووە بۆ ئەوەی ئاستی

زیرەکی و عەقلی مرۆڤ پێش بکەوێت و بگاتە لووتکەی داهێنانەکان، بەڵام بۆچی لە هیچ مەیموونێکدا ئەم تایبەتمەندییە تۆزێك هەستی پێ ناکرێ و بوونی نییە؟. ئێستا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئایا دەکرێ ئەو مەیموونانەی کە بالآیان چەماوە بووەو لەسەر چوار پێ دەڕۆیشتن بەرە بەرە پەرەیان سەندبێ تاوەکو لە سەردەمێکدا توانیان لەسەر دوو پێ بڕۆن و ببنە مرۆڤ؟ **ئایا دەکرێ ڕۆیشتن لە سەر چوار پێ، بە پەرەسەندن بگۆڕێ بۆ ڕۆیشتن لە سەر دووپێ؟**

بێگومان ئەمە هەرگیز نابێ، چونکە ئەگەر ئەمە وا بێت ئەوا دەبێت لە نێوان هەردوو حاڵەتەکە حاڵەتێکی تری نامۆ دروست بێت کە نە وەك ڕۆیشتنی مەیموون وابێت نە وەك هی مرۆڤ، ئەو مەیموونانەی کە لەسەر چوارپێ دەڕۆیشتن یەکسەر ناتوانن هەستنەوە سەر دوو پێ، بەڵکو دەبێت سەرەتا جۆرێکی تری ڕۆیشتن دروست بێت کە وەکو حەلقەیەکی گواستنەوە وابێت لە نێوان ڕۆیشتن لەسەر چوارپێ و ڕۆیشتن لەسەر دووپێ، باشە ئەم شێوازی ڕۆیشتنە نامۆیەی نێوان ئەم دوو حالەتە تۆ بڵێی چۆن بێت؟ بێگومان لە نێوان ڕۆیشتن لەسەر چوار پێ و ڕۆیشتن لەسەر دوو پێ، هیچ حالەتێکی تر نییە، گیانداری ووشکانی یان دەبێت لەسەر چوار پێ بڕوات یان لەسەر دوو پێ کە لەنێوان ئەم دووانەدا هیچی تر نییە، بەڵام ئەگەر مەیموون بە پەرەسەندن بووبێتە مرۆڤ، ئەوا دەبێت لەنێوان ئەم دوو بارەدا جۆرێکی تری ڕۆیشتن هەبووبێت. بێگومان ئەمەش ئاستەنگێکە لەبەردەم پەرەسەندن و (**ڕۆبن کرۆمبتۆن**) زۆر بەتوندی جەختی لەسەر دەکاتەوەو دەڵێت (**گیاندار دوو هەڵبژاردەی لەبەردەم دایە، یان دەبێت بە باڵایەکی ڕاست لەسەر دوو پێ بڕوات یان**

دەبێت لەسەر چوار پێ بڕوات، لەنێوان ئەم دوو شێوازەدا هیچی تر نییە)....

دواتر شتێکی تری زۆر سەیر هەیە لە جیاکەرەوەکانی مرۆڤ کە جێگەی تێڕامان و لێ وورد بوونەوەیە، کاتێك سەیری زیندەوەران و گیانداران دەکەین دەبینین هەر جۆرێکی زیندەوەر، چەندین لقی لێ دەبێتەوەو لەنێوان لقەکاندا چەندین جیاوازی جەستەیی بەدی دەکەین، بۆ نموونە مێرووەکان بە چەندەها لقی جیاواز دەردەکەون و تیایاندا هەیە باڵدارەو هەشە بێ باڵە، هەروەها هەندێکیان ڕەنگیان سپی یە و زۆربەشیان ڕەشن، وە هەندێکیان قاچیان درێژەو قەبارەیان گەورەیە بەڵام هەندێکیان بچووکن، سەرەڕای ئەم جیاوازییە جەستەییانە کەچی هەموویان یەك جۆرن و پێیان دەووترێ مێروو. وە هەروەها ئەم حاڵەتە لە باڵندەکانیشدا بەدی دەکرێ، بۆ نموونە هەندێ جۆری کۆتر زۆر گەورەترن لە جۆرەکانی ترو هەندێکیان قاچیان بەتەواوی بە تووك داپۆشراوە بەڵام ئەوانی تر وانین. بێگومان ئەم حاڵەتە لە هەر هەموو جۆرەکانی گیانداران دا بەدی دەکرێ تەنانەت لە مەیموونەکانیش دەبینین کە چەندین جیاوازییان هەیە لە ڕووی لاشەییەوەو تیایاندا هەیە دەستی زۆر لەوانی تر درێژترەو هەشیانە زۆر بچووکە و هەشیانە زۆر گەورەیە، هەر لەبەر ئەمەشە کە مەیموون چەندین لقی لێ دەبێتەوە و بەناوی هەمەجۆر ناو دەنرێن کە هەر یەکەیان جیاوازن لەوانی تر بۆ نموونە:

(گیبۆن ، جبون ، ئۆرانگ ، غۆرێللا ، شەمبازی)»..

بەڵام ئـەم حاڵەتـە لـە مرۆڤـدا هـەرگیز بـەدی نـاکرێ و بـوونی نییـە، چـونکە لـە سەرتاسـەری گـۆی زەوی دا مرۆڤـەکان هـەر هـەموویان یـەك جۆرن و هیچ فەرق و جیاوازییەکی جەستەییان نییـە، لە هەموو دونیـادا مرۆڤێك نییە کە دەستی یان قاچی لەوانی تـر درێـژ تـر یـاخود کورت تـر بێـت، ئایـا هـیچ مرۆڤێـك هەیـە لـە دونیـادا بـاڵی هـەبێت یـان ژمـارەی پەنجەکانی لەوانی تر زیاتر بێت یان قەبارەی بچوکتر بێت؟ بێگومان شـتی وا مەحاڵە چونکە لە هەموو جیهاندا مرۆڤـەکان هەموویان وەکو یـەکن و بـە زەرڕە جیاوازییـان نییـە لـە ڕووی پێکهاتـەی ئەندامـەکانی لەشـەوە هـەموویان یـەك جۆرن، ئەمـەش بـە تـەواوی پێچەوانەی سروشـتی هـەر هـەموو گیاندارانـەو لەمـەوە بـە ڕوونـی دەردەکـەوێ کـەمرۆڤ کـائینێکی سـەربەخۆیەو بـە تـەواوی جیـاوازە لـە ئـاژەڵان و هـیچ پەیوەندییـەکی پێیانەوە نییە....

کاتێـك تێبـینی نووسـراوەکانی زانایـانی پەرمسـەندن دەکـەین دەبیـنین زۆر بەگرنگی پێدانەوە باسی (درەخت)ی قۆناغەکانی پەرمسەندنی مـرۆڤ دەکـەن و ڕایـان وایـە کـە ئـەم درەختـە بابـەتی بناغـەو ئەسڵی مـرۆڤ بـە تـەواوی ڕوون دەکاتـەوە، زانایـانی  پەرمسـەندن درەختێکـی گریمانییـان کێشـاوە بـۆ ڕوون کردنـەوەی بنچـینەو ڕەچـەڵەکی مـرۆڤ و لێکدانـەوەی قۆنـاغـەکانی گـۆڕان و پەرمسـەندنی جەسـتەیی مـرۆڤ کـە بـە (درەخـتی نەســەبی مــرۆڤ) ناســراوە. لــەم درەختــەدا ســەرجەم قۆناغــەکانی دروستبوونی مرۆڤ لە مەیموونەوە تاکو مرۆڤ، پایە پایە ڕوون کراوەتـەوەو بە شێوەیەکی گشتی پێنج قۆناغی دیاری کردووە بۆ لێکدانـەوەی مێـژووی دەرکەوتنی مرۆڤ بەم شێوەیە:

**قۆناغی یەکەم/ مەیموونە پێشکەوتووەکانی باشوری زەوی...**

**قۆنـاغی دووەم/ ئـەو مرۆڤـەی کـە توانـای بـەکارهێنانی کەرەسـتەی هەبوو...**

**قۆناغی سێ یەم/ مرۆڤی باڵا ڕاست کە لەسەر دوو پێ دەڕۆیشت...**

**قۆناغی چوارەم/ مرۆڤی عاقڵی کۆن...**

**قۆناغی پێنجەم/ مرۆڤی ئەمڕۆ...**

بە گوێرەی بیروڕای بانگەوازکارانی ئەم درەختە خەیاڵیە، مرۆڤەکانی قۆناغی دووەم و سێ یەم مرۆڤی تـەواو نـەبوون و بـەڵکو تـازە لـە قۆنـاغی مەیموونێتی هاتبوونە دەرەوەو هێشتا عـەقل و لاشـەیان سـەرەتایی بـووەو سیفاتی ئاژەڵانەیان هەر تێدا مابوو، پاشان عەقل و بـیرو هۆشـیان گەشـەی کردو بوونە ئەو مرۆڤە زیرەکەی ئەمڕۆ. بەڵام پرسیار لێرەدا ئەوەیـە کـە بۆچی بـۆ مرۆڤـەکان گونجـا کـە عـەقل و هۆشـیان پـەرە بسـەنێت بـەڵام مەیموونـەکانی پـێش ئـەو، بۆیـان نەڕەخسـا کـە عـەقلیان پەرەبسـەنێت و ببنە مەیموونی عاقل لە کاتێکدا هەردووکیان لەیەك ژینگەدا ژیاون؟.

ئێسـتا بـا چـەند ڕوون کردنەوەیـەك بخەینــە ڕوو لــەبارەی قۆناغــە گریمانیەکانی ئەم درەختە، قۆنـاغی یەکـەم و دووەم زۆر بەئاشـکرایی دژی یەکـدین و لێـك دوورن، چـونکە لـە قۆنـاغی یەکـەم دا نـاوی مـەیموونی هێنـاوەو یەکسـەر لـە قۆنـاغی دووەم دا دەیکاتــە مـرۆڤ و باسـی هـیچ قۆناغێکی گواستنەوەی پەرەسەندن ناکات لەنێوان ئـەم دووانـە، بێگومـان ئەمە لەبەر ئەوەیە چونکە حەلقەی گواستنەوەی نێوان مـەیموون و مـرۆڤ دیار نییەو هەرگیز نەدۆزراوەتەوە لەنێو تۆماری بەبەردبووەکان، ئەم دوو

قۆناغــە وەك ئــەوە وایــە کــە کاغــەزێکی ســپی لەســەر کاغــەزێکی ڕەش دابنێیت و بڵێیت ئەم کاغەزە ڕەشە یەکسەر بە پەرمسەندن ئەم کاغەزە سپی یەی لێ دروست بووە.....

هەروەها لەم قۆناغانـەدا شـتێکی تـر دێتـە پێشـەوە کە شـیاوی ئەومیـە لێکۆڵینـەوەی لەسـەر بـدەین، ئەگـەر قۆناغـەکانی ئـەم درەختـە نەسـەبیە ڕاست بێت کە بە پەرمسەندن لە یەکتریـیەوە دروست بوون، ئەوە بێگومـان دەبێت لە یەکەم ساتی دەرکەوتنی مرۆڤدا تەنها ئەو مرۆڤانە هەبووبن کە توانای بەکارهێنانی کەرستەکانیان هەبوو، نابێت لەو قۆناغەدا مرۆڤی باڵا ڕاست هەبووبێت، چونکە خۆ هێشتا مرۆڤی پێشوو پەرەی نەسـەندووە بـۆ مرۆڤـی باڵاڕاسـت، پاشـان لـە قۆنـاغی دووەمـدا دەبێـت تـەنها مرۆڤـی بـاڵا ڕاســت هــەبووبێت نابێــت هــیچ جــۆرێکی تــر هــەبێت، واتــە دەبێــت هەرجۆرێکی مرۆڤ لە قۆناغی خۆی هـەبووبێت و نابێت هیچیان تێکـەڵی زەمانی ئەویتر ببێت، بەڵام بەبەردبووە دۆزراوەکان بە تەواوی پێچەوانەی ئەمەیان دەرخست کاتێك زانای جیۆلۆجی (لویس لیکی) لە چینی دووەمی زەوی داو لە یەك شوێندا لاشەی بەبـەردبووی هەریـەك لـە مەیموونـەکانی باشـور و مرۆڤـی بەکارهێنـەری کەرەسـتەو مرۆڤـی بـاڵا ڕاسـتی بەیەکـەوە دۆزییەوە، ئەم دۆزینەوەیە ئەوەی دەرخست کە لـە سـەردەمێکدا هـەر سـێ جۆرەکە لە یەك کاتدا هەبوون و بەیەکەوە دەژیان و هەریەکان سـەربەخۆ بـوون. پـاش ماوەیـەك لـە ئـەنجامی گـەڕان بـەدوای پاشمـاوەی بەبـەرد بووەکان، (لیکی) دووبـارە لـە هـەمان چینی دووەم دا پاشمـاوەی کـەپرێکی بـەردینی دۆزییـەوە کـە بـە مرۆڤـی زیـرەك نـەبێت دروسـت نابێـت، بەمـە دەرکـەوت کـە لـەم سـەردەمەدا مرۆڤـی عـاقلیش لەگـەڵ ئـەوان ژیـاوە لـەم چـینە جیۆلۆجیـە کۆنـەدا کـە مێژووەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ نزیکـەی ٨٣

ملیـۆن سـاڵ پـێش ئێسـتا. لـە کاتێکـدا بـە گوێرەی درەخـتی پەرەسـەندنی مرۆڤ، دەبوایە هەریەکەو لە قۆناغێـك و سـەردەمێکی جیـاواز هەبووایـە و هەرگیز نابێت دوو جۆریـان بـە یەکـەوە لـە یـەك کاتـدا هـەبن، چونکە تـا جۆری یەکەم پەرە نەسەنێت و بنەبڕ نەبێت، چۆن جـۆرێکی نـوێی دووەم دێتە کایەوە؟ ئەم دۆزینـەوەی (لیکی)، بـووە کۆسـپێکی گـەورە لـە بـەردەم پەرەســەندنی مــرۆڤ لــە مەیموونــەکان و زانایــانی پەرەســەندن هــەرگیز نــەیانتوانی بەســەریدا زاڵ بــن، لــە دان پیانانێکــدا (**ســتیفن جــای گۆڵــد**) دەڵێت: (**کوا قۆنـاغ و پایەکانی پەرەسـەندن چـی لـێ هـاتووە لـە کاتێکـدا دەبینین کە هەر سێ جۆری مرۆڤ بە یەکەوە لە یەك قۆناغدا هەبوون بێ ئەوەی هیچ یەکێکیان پەیوەندی بەوی ترەوە هەبێت؟**)....

دواتر ئەوە چ شتێکە دەیسەلمێنێت کە مرۆڤـە سـەرەتاییەکانی قۆنـاغی یەکـەم و دووەم نیـوە مـرۆڤ بـوون و بەشـێکیان چـۆتەوە سـەر مـەیموون و ئـاژەڵان؟ تائێسـتا گشـت ئـەو بەبـەرد بووانـەی کـە لـە کـۆنترین چـینە جیۆلۆجیەکانـدا دۆزراونەتـەوە ئـەوە دەسـەلمێنن کـە کـۆنترین مرۆڤـەکانی وەکــو نیانـــدرتاڵ و کرۆمـــانیۆن و چـــەندانی تـــر لـــە ڕووی غـــەریزەو ڕەفتارەکـانی ژیانـەوە هیچیان کـەمتر نـەبووە لـە مرۆڤـی ئێسـتا، گومـان لەوەدا نییە کە لە سەردەمێکدا مرۆڤ لە سەردارەکان و لە نێـو قـەدی شـاخ و ئەشـکەوتەکاندا ژیـاوەو مـاڵی لـەوێ بـۆ خـۆی بنیـات نـاوەو بـە گـەڵای دارەکـان جەسـتەی خـۆی داپۆشـیوە، ڕاسـتە لـەم ڕووەوە زۆر لـە ئـاژەڵان دەچـوو، بـەڵام ئەمـە هـەرگیز مانـای ئـەوە نییـە کـە مرۆڤـی ئـەو کاتـە، نیوەیان چۆتەوە سەر ئاژەڵان چونکە مرۆڤ لەو کاتەشـدا بـە شـێوەیەکی وا ڕوحیانە مامەڵەی لەگـەڵ ژیـان دەکـردو شـتی وای بـە مێشك دادەهـات کـە زیـرەکترین ئـاژەڵیش بـە زەرڕە ئـەو توانایـەی مرۆڤـی نـەبوو. تـا ئێسـتا

کۆنترین پاشماوەی بەبەرد بووی مرۆڤ کە دۆزرابێتەوە، بریتییە لە جۆرەکانی مرۆڤی پەکین و کرۆمانیۆن و نیاندرتال کە لە کاتی لێکۆڵینەوە لە ڕەفتارەکانی ژیانیان، گومان لەوەدا نامێنێ کە ئەمانە هیچیان لە مرۆڤی ئێستا کەمتر نەبووە....

## */مرۆڤی پەکین Paking man

بە یەکێك لە کۆنترین مرۆڤە دۆزراوەکان دادەنرێت کە وەك دەرکەوتووە ئەو مرۆڤە ڕەنگە لە سەرەتاکانی چاخی بەستەڵەك دا ژیابێت، پاشماوەکانی ئەم مرۆڤە لە ئەشکەوتێکدا دۆزرایەوە لە دووری (٤٠) میل لە باشوری (پەکین)ی پایتەختی وولاتی صین.جیاوازییەکانی ئەو مرۆڤە لەگەڵ مرۆڤی ئێستا ئەوە بوو کە ئێسکی ژێر برۆیان بە زەقی دیار بووەو نێوچەوانیان بەرەو پشتەوە هەلگەڕاوەتەوە و شەویلگەی خوارەویان گەورە بووە. هەروەها لەگەڵیاندا پاشماوەی چەند ئاژەڵێکیش دۆزرایەوەو سەرجەم بەلگەکان ئامازە بەوە دەکەن کە ئەو مرۆڤانە لە ڕووی هێزو تواناو زیرەکییەوە زۆر سەرکەوتوو بوون و هیچ سیمایەکی ئاژەلانەیان پێوە دیار نەبووە، لە توێژینەوەکاندا دەرکەوتووە کە ئەو مرۆڤانە ئاگریان لە کاتی پێویستدا بەکار دەهێناو توانای دروستکردنی هەموو ئەو کەرەستە و ئامێرانەیان هەبوو کە پێویستیان پێ دەبوو....

## */مرۆڤی نیاندرتال Neanderthals

نیاندرتالییەکان ئەو مرۆڤانە بوون کە نزیکەی زیاتر لە (١٠٠) هەزار ساڵ بەر لە ئێستا لە ئەوروپادا دەژیان کە بەرە بەرە وون بوون و نەمان، ئەم نەمان و بنەبڕ بوونەی نیاندرتالیەکان وە نەبێت ببێتە بەلگە لەسەر

ڕاسـتی یاسـای (هەڵبـژاردنی سروشـتی) کـە داروین بانگەشـەی بـۆ دەکـرد، بـەڵکو ئـەم بنـەبڕ بوونـە زۆر بـەڕوونی دەبێتـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوەی کـە مرۆڤی نیاندرتال مرۆڤی تەواو و کامـل بـوون و هیچیان لـە مـرۆڤ کـەمتر نـەبووە، چـونکە ئـەم نیاندرتالیانـە لەگـەڵ ڕەگـەزەکانی تـری مرۆڤایـەتی تێکـەڵ بـوون و بـەرە بـەرە سـیفاتی جەسـتەیی نـوێ بـە بۆمـاوە لـە نەوەکانیاندا دەردەکەوت و شێوازە جەستەییە کۆنـەکانی نیانـدرتالی وون بـوو، جا لەمـەوە دەردەکـەوێ کـە مرۆڤـی نیانـدرتال هـەرگیز نیـوە ئـاژەڵ نەبوون، بەڵکو مرۆڤی کامل و تەواو بوون چونکە ئەگەر وا نەبوایە، چۆن ڕێگە دەدرا کە بە هاوسەرگیری تێکەڵی ڕەگەزەکانی تری مرۆڤایەتی ببن؟.

گەورەترین جیاوازی مرۆڤی نیاندرتال لەگەڵ مرۆڤی ئێستا، ئەوە بـوو کـە ئێسـکە پەیکـەریان زۆر لـە هـی مرۆڤـی ئێسـتا بـەهێزتر بـووەو بۆشـایی کەللەی سەریان فـراوانترو گـەورەتر بـووە، هـەرگیز نـاکرێ نیاندرتالیـەکان وەکو جۆرێکی سەرەتایی سەیریان بکرێ هەروەك کە زانایانی پەرەسـەندن دەڵێن ئەمانە حەڵقەی نێوان ئاژەڵ و مرۆڤ بوون و پـەرەیان سـەندووە بـۆ مرۆڤ، نیاندرتالیەکان هـیچ جیاوازیـەکیان نـەبووە لەگـەڵ مرۆڤـی ئـەمڕۆ، چونکە لـە ڕووی ڕەفتارەکـانی ژیانـەوە زۆر بـە ئاسـانی دەیـانتوانی بەسـەر ئاسـتەنگەکانی ژیانـدا زاڵ بـن و عـەقل و هۆشـیان هـەرگیز سـادە نـەبووە، هـەروەك زانـای پسـپۆر لـەبواری زانسـتی بەبـەردبووەکان (ئـەریك) لـەم بارەیـەوە دەڵێـت: (بـەراورد کردنـی پەیکـەری ئێسکی مرۆڤـی نیانـدرتال لەگەڵ ئێسکە پەیکەری مرۆڤی ئەمڕۆ، زۆر بە ڕوونی ئەوە دەردەخات کە مرۆڤی نیاندرتال هیچی کەمتر نەبووە لە مرۆڤی ئێستا لـە ڕووی توانـای عەقل و جووله و کارکردن و بیرکردنەوە و قسەکردن)..

هــەر لەبــەر ئــەم هۆیەشــە کــە زۆربــەی توێــژەرانی ســەردەم نــاوی نیاندرتالیەکان بە Homo Spienis – Neanderthalensis دەهێـنن واتا ڕەگەزی (**مرۆڤی نیاندرتالی عاقل**)،،

جا بۆیە هەڵەیەکی زۆر گەورەیە کە ڕەگەزی نیاندرتالیەکان بە مرۆڤی سەرەتایی نا عاقل دابنـرێن، چونکە دۆزینـەوەو توێژینـەوەکان وامـان بـۆ باس دەکەن کە نیاندرتالیەکان زۆر بە شێوەیەکی ئاسایی مـردووی خۆیـان دەناشــت و توانــای دروســتکردنی چــەندین کەرەســتە و کــەل و پــەلی ناوازەشــیان هــەبوو، ئەمانــە بــە هــیچ ســیفەتێك نەچــوونەتەوە ســەر مەیموونەکان، بەڵکو تەنها جنسێکی بەشـەری و مرۆڤایـەتی بـوون کـە بـە تێکـەڵ بوونیـان لەگـەڵ ڕەگـەزەکانی تـرو بـە تێپـەڕبوونی کـات بنـەبڕ بوون....

## */**مرۆڤی کرۆمانیۆن** cro – Magnon

کرۆمانیۆن هەروەك وا خەیاڵ کـراوە کـە (٣٠) هـەزار سـاڵ پـێش ئێسـتا ژیاون و جیاوازیان لەگەڵ مرۆڤی ئێستا ئەوە بووە کە کەللـەی سـەریان لـە شێوەی قوببە بووەو نێو چاوانیان پان بووەو بۆشـایی کەللـەی سـەریان لـە هی مرۆڤی ئەمرۆ گەورەتر بووەو برۆیان چڕ بووە. لە ڕووی دیـاریکردنی شوێنی ژیانی ئەمانە جیاوازی هەیە کە بە شێوەیەکی ڕەسمـی بـە ڕەگـەزی ئـەوروپی ناسـراون، بـەڵام گـەورەیی و پتـەوی کەللـەی سـەریان، وای لـە هەندێك توێژەر کـردووە کـە بڵێن ئەمانـە یـەکێك بوونـە لـە ڕەگـەزەکانی مـرۆڤی ئـەفریقی، چـونکە هەنـدێك لـە ڕەگـەزەکانی مرۆڤـی ئـەفریقیای ئێسـتا زۆر دەچـنەوە سـەر ئـەوان لـە ڕووی پێکهاتـەی کەللـەی سـەرەوە، هەروەها لە ڕووی بـاڵا بەرزییـەوە چونکە مرۆڤـی کرۆمـانیۆن باڵایـان زۆر

لە هی مرۆڤی ئێستا درێـژتر بووە. پاشماوە و پەیکـەری ئـەم مرۆڤانـە لـە ئەشکەوتی (کرۆمانیۆن) دۆزرایەوە کە هەنـدێك لـە زانایـان دەڵـێن ڕەنگـە ئەمانە هۆزێکی مرۆڤایەتی بووبن کە لە چاخی بـەردینی کۆن ژیـاون. لـە هـەمان شـوێنی ئـەم مرۆڤانـە، چـەند کەرەسـتە و کـەل و پـەلێکی وا دۆزرایەوە کە بە ڕاشکاوی دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئەمانـە مرۆڤـی زیرەك و کامل بوون و دوور بوون لە ژیان و سیفاتی ئاژەڵانـە، چونکە بـە لێزانییـەوە کەرەسـتە پێویستەکانی خۆیـان دروسـت دەکـرد. هـەروەها لـە شـوێنێکی تـری دوور لـەم ئەشـکەوتە، دوو پەیکـەری تـر دۆزرایـەوە کـە ئـەوانیش هـەرهی سـەردەمی چـاخی بـەردینی بـوون بـەڵام لـە ڕووی پێکهاتـەی ئەندامـەکانی لەشـەوە زۆر جیـاواز بـوون لـە مرۆڤـی کرۆمانیۆن.....

### */مرۆڤی جاوە Phitecanthrope

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا پزیشکێکی گەنجی هۆڵەندی بـە خـەیاڵ بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە دەبێت حەلقەیەکی ناوەنـد لـە نێـوان مـرۆڤ و مـەیموون دا هـەبێت کـە بـە یـەکیان ببەسـتێتەوە، ئـەم گەنجـە کـە نـاوی (دۆبویس) بوو هەردەم هەوڵی دۆزینـەوەی پاشمـاوەی ئـەو گیانـدارەی دەدا کـە بـە ڕای ئـەو ناوەندێکـە لـە نێـوان مـرۆڤ و مـەیموون و ئـەو گیانـدارە ناوەندییەشـی نـاو دەنـا بـە (Phitecanthrope) واتـە (مرۆڤـی مەیموونی) چونکە لە زمانی یۆنانیدا ووشەی (phiteos) واتە مەیموون، هەروەها ووشەی (Anthropos) واتە مرۆڤ..

(دۆبـویس) وای خـەیاڵ دەکـرد کـە ئـەم حەلقـە ناوەندییـەی نێـوان مەیموون و مرۆڤ، لـە هەرێمـە گەرمـەکان دەدۆزرێتـەوە چونکە ڕای وابـوو

کە ئەمانە لە ناوچە گەرمەکانـدا ژیاون و کرداری پەرەسـەندن لـە ژێـر کاریگەری پلەی گەرمی بەرزەوە ڕوویداوە...

پاش ماوەیەك (دۆبویس)، وەکو پزیشکێکی سەربازی دامـەزرا لـە نێـو سوپای هۆڵەنـدی بەمـەش دەرفـەتێکی گـەورەی بـۆ ڕەخسا بـۆ گـەڕان و بینـینی چەندین ناوچەی زانستی هەمـەجۆر، هـەر لەگـەڵ گەیشتنی بـۆ ناوچەی (جاوە) هەڵسا بە هەڵکەندنی چەند چاڵێك لـە پێنـاو دۆزینـەوەی (ناوەنـد)ی نێـوان مـرۆڤ و مـەیموون کـە نـاوی نـابوو مرۆڤـی مـەیموونی. (دۆبویس) لە ئەنجامی پشکنینەکانی لەم ناوچەیەدا، دوو (ددان) ی خرێی دۆزییـەوە کـە وای بۆچـوو کـە ئـەم دوو ددانـە هـی مـەیموونێکی جـۆری (شەمبازی) بووبن، هەروەها لە شوێنێکی دوورتـر لەمانـە، کەللە سـەرێکی دۆزییـەوە کـە ووتـی ئـەویش هـەر هـی هـەمان مەیموونـە، لـە دوای تێپـەڕ بوونی ساڵێك، (دۆبویس) لە هەمان شوێندا ئێسکێکی (ڕان) ی دۆزییەوە و لـە پـاش بیرکردنەوەیـەکی زۆر، ووتـی ئـەم ئێسـکەش هـەر هـی هـەمان مەیموونی شەمبازییە، دۆبـویس کاتێـك سـەیری ئـەم پاشمـاوە دۆزراوانـەی دەکرد دەیبینی کە لە زۆر ڕووشەوە لە مرۆڤ دەچن بۆیە کاتێـك گەڕایـەوە لـە کۆنگرەیـەکی زانسـتیدا ووتـی: **مـن مرۆڤـی مـەیموونیم دۆزییـەوە Phitecanthrope**..

دۆبـــویس لـــە توێژینەوەکەیـــدا زۆر بـــەخێرایی بڕیـــاری داو لـــە دۆزینەوەکەیدا زۆر بەهەڵە داچووبوو، چونکە هەر لە سەرەتاوە پشتی بـە خـەیاڵ و گریمـان بەسـتابوو، دۆزینەوەکـەی (دۆبـویس) تـەنها جێگـەی پێکەنینە، چونکە چۆن دەکرێ مەیموونێکی شەمبازی بمرێت و ددانەکانی لـە شـوێنێکدا بدۆزرێتـەوە، کەچـی کەللـەی سـەری لـە شـوێنێکی تـر

بدۆزرێتەوە کە (١٥) مـەتر لـە شـوێنی ددانـەکانی دوورە! هـەروەها ئێسکی ڕانی لە شوێنێکی تر و پاش تێپەڕ بوونی سـاڵێك بدۆزرێتـەوە! ئەمـە ئـەو پەڕی شێواندنی ڕاستیە زانستییەکانە...

سـەرجەم ئـەو مرۆڤـە کۆنانـەی کـە لێـرەدا ئاماژەمـان پـێ کـردن و چەندانی تـریش هـەرگیز نـاکرێ بـە ئـاژەڵ و مـەیموون بناسـرێن، چـونکە ئەمانـە دروسـتکراوی وا بـەهێزبوون کـە لـە کشـتوکاڵ و ڕاو و خانوسـازیدا لـەو پـەری هێـز و لێزانیـدا بـوون، چـۆن دەکـرێ تـەنها لـە بـەر چـەند جیاوازییـەکی جەسـتەیی لەگـەڵ ئێمـە، بـە گیانـدار وەسـفیان بکـرێ. لـە سەردەمی ئێمەدا، مرۆڤ ڕاو دەکات و کشتوکاڵ دەکات و کار دەکـات و شـەڕ دەکات و دەستیشی بەسەر هەموو گیاندارانـدا گرتـووە بـە مەیموونیشـەوە، بێگومـان مرۆڤـی نیانـدرتال و کرۆمـانیۆن و گشـت مرۆڤـە کۆنـەکانی تـر، هەروا بوون و هەموو ئەم کارانەیان دەکـرد، ئەمـە ڕاسـتیەکە گشـت لایـەك دانی پیا ناوە، کەواتـە هەڵەیـەکی زۆر گەورەیـە ئەگـەر جۆرەکـانی مرۆڤـی کۆن بە ئاژەڵ لە قەلەم بدرێن و بکرێنـە بەڵگە لەسەر پەرەسەندنی مـرۆڤ لە مەیموونەکان، بەڵکو ئەمانە مرۆڤێکی تەواو و کامل بوون، بـەڵام ئێسـتا لێرەدا جێگەی خۆیەتی بپرسین ئەگەر ئەوانە مرۆڤی تەواو بووبن، ئـەی بۆچی عەقل و هۆش و ئاستی زانیاریان ئەوەندە سادەو کەم بووەو لە نێو ئەشکەوت و لەسەر دارەکاندا دەژیان؟ بۆچی وەکو مرۆڤی ئەمڕۆ، ژیانێکی شارستانییان نەبووە؟

بێگومان ئەمە لەبـەر ئەوەیـە چـونکە ئـەو سـەردەمەی کـە ئـەوانی تیـا دەژیا، سەرەتای دەرکەوتنی مرۆڤایەتی بوو کە هێشتا کاتی ئەوە نەبوو کـە دەست بە بیرکردنەوەی فکری و زانستی بکەن، بـەڵکو هـەموو هـەوڵیان بـۆ

ئەوە بووە کە خۆراك پەیدا بکەن و خۆیان بپارێزن، ئەو مرۆڤە کۆنانە سەرەتای دروست بوونی مرۆڤ بوون لە لایەن خواوە کە ئەرکی سەرشانیان تەنها ئەوە بوو کە فێری داهێنانی ئاگر و خۆپاراستن و دروستکردنی خواردن و بنیاتنانی خانوو ببن، چونکە ئەمە گرنگترین ئەرکە کە پێویست بوو لە سەرەتای مرۆڤایەتی ئەنجام بدرابایە بۆ ئەوەی مرۆڤی ئەمرۆ ئەم ئەرکەی لەسەر شان نەمێنێت و هەوڵی چوونە نێو بۆشایی ئاسمان و دۆزینەوەی گەردیلەو داهێنانی تۆڕەکانی پەیوەندی و دروستکردنی تەیارەو سەیارە بدات نەك دروستکردنی ئاگر و فێربوونی ڕاو، کەواتە کەمی و نزمی ئاستی زانیاری مرۆڤە کۆنەکان، ویستی خوای لەسەر بووە تاوەکو ڕەگەزی سەربەخۆی مرۆڤایەتی بەرە بەرەو قۆناغ بە قۆناغ، عەقلی خۆی پەرە پێ بدات و بێتە ناو داهێنانی نوێی زیرەکانە،

★ من لێرەدا وای بۆ دەچم کە گەیشتوومەتە سەرەنجامی بیرو باوەڕی پەرەسەندنی مرۆڤ لە ئاژەڵانەوە، ئەویش ئەومیە کە ئەگەر کەسێك بڵێت مرۆڤ لە ئاژەڵ و مەیموونەکانی پێش خۆیەوە دروست بووە، ئەوە وەك ئەوە وایە کە بڵێت پێشکەوتووترین جۆرەکانی فرۆکە لە کۆڵلارەی منالانەوە دروست بووە!..

لە بەشی پێشوودا شتێکم ووت لێرەش دەیڵێمەوە ئەویش ئەومیە کە کرداری دروستبوونی ژیان و دروستبوونی مرۆڤ ئارێشەیەکی وا دژوارە کە چەندین ئاستەنگ و کێشە و چەڵەمەی دێتە بەردەم، بۆیە لە کاتی توێژینەوە لە بنچینەی مرۆڤدا، دەبێت هەردەم ئەو بیروڕایە وەربگرین کە باسی دەسەڵات و هێزێکی کاریگەرمان بۆ بکات بۆ ئەوەی لادان و نەهێشتنی ئاستەنگەکان بگرێتە ئەستۆی خۆی و بەسەر تەنگ و

چەڵەمەکاندا زاڵ بێت. لێرەدا دەمەوێت باز بدەم بەرەو بیروڕای دووەمی پەیوەست بە دروست بوونی مرۆڤ کە ئەویش باوەڕی دروستکردنی سەربەخۆی مرۆڤە دوور لە پەرەسەندن.

بابەتی چۆنیەتی پەیدابوون و دروست بوونی مرۆڤ وەنەبێت شتێکی نوێ بێت و هی ئەم سەردەمە بێت بەڵکو هەزارەها ساڵ بەر لە ئێستا، مرۆڤەکان لەبەر ئەوەی عەقلیان بەهێز بوو، ئەم بابەتەیان هەردەم بە مێشك دادەهات و لە بارەی سەرەتای دەرکەوتنی مرۆڤ بیری هەمە جۆریان دەکردەوە، جا بۆیە هەر لەم کاتانەدا ئاینە ئاسمانییەکان هەڵسان بە ناساندنی (خوا) بە مرۆڤەکان و ئایین بووە یەکەم بیردۆز کە دیاردەو بارە ئاڵۆزەکانی بوونەوەری بە شێوازێکی تایبەتی بە بەرچاوی مرۆڤەوە ڕوون دەکردەوە، ئایینەکان لە گشت قۆناغە جیا جیاکاندا یەك بانگەوازی هاوبەشیان خستەڕوو لە بارەی چۆنیەتی دروست بوونی مرۆڤ، ئەویش ئەوە بوو کە یەکەم مرۆڤ بە ناوی (ئادەم) دروستکرا بە سەربەخۆیی لە لایەن خواوە کە لە پێش ئەم ئادەمەدا هیچ مرۆڤێکی تر بوونی نەبوو، کاتێك تێبینی دەقەکانی کتێبە ئاسمانیەکان دەکەین، یەك ووشە لە بارەی ئەفسانەکانی پێشووی وەکو پەرەسەندنی مرۆڤ لە مەیموون و ئاژەڵانەوە بەدی ناکەین لە کاتێکدا بابەتێکی وا گرنگ ئەگەر ڕاست بوایە، بە لایەنی کەم دەبوایە کتێبێکی ئاسمانی ئاماژەی پێ بکردایە. چیرۆکی دروست بوونی ئادەم لە کتێبە ئاسمانیەکاندا ئەوەیە کە کاتێك خوای گەورە ویستی مرۆڤ دروست بکات، یەکسەر پەیکەرێکی لە شێوەی ئادەمیزاد لە خۆڵ دروستکردو پاشان لە ڕوحی خۆی فووی پێدا کردو بەمە گیانی وەبەر هات و بووە مرۆڤێکی عاقل و فێری گشت ناوەکان بوو.

هـەروەك دەبیـنـین کـە خـودای گـەورە دەفـەرمووێ ﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ﴾ {ص ٧١،٧٢}،. واتـە: (پـەروەردگار بـە فریشـتەکانی ووت، مـن مرۆڤێـك لـە قـوڕ دروست دەکەم، جا کاتێك تەواوم کردو لە ڕوحی خۆم فووم پیا کـرد، ئێـوە کڕنووشی بۆ بەرن.). ئەم دەقە کورتە بۆ هـەزارەها سـاڵ سەرچاوەی بـیرو باوەڕی خەڵك بوو، کەچی لە سـەدەی هـەژدە و نـۆزدەدا، فەلسـەفە دەسـتی کــردە چـەکی پەرمســەندن و بڕیــاری جـەنگی دا لەگـەڵ سـەرجەم ئــەو عەقیـدە و بــاوەڕە ئاینیانــەی کـە لـە ڕێگـەی ڕوون کردنـەوەی خـەلقی ئادەمەوە هەوڵی سەلماندنی دەسەڵاتی خوایـان دەدا، باشـە بۆچـی بیرۆکـەی دروسـت بــوونی ئــادەم لــە خــۆڵ و ڕوح لەگــەڵ عــەقلی هەنــدێ کــەس ناگونجێـت؟ بێگومــان لەبــەر ئەوەیــە چـونکە ئــەو کەســانە لــە ناخــەوە گومانیان لە هەبوونی خودا هەیە یان هەر باوەڕیان بـە بـوونی خـوا نییـە، جا بۆیە هاتوون ساختەکاری و ئەفسانەی پەرمسـەندنیان وەکـو بـەدیل لـە جێگەی بیروباوەڕە ئایینیەکە داناوەو کـەلێنێکی بـەتاڵی خۆیانیـان پـێ پـڕ کردۆتەوە لە پێناو دامەزراندنی چەند بیروباوەڕێکی ئیلحادی کوێرانە کـە تەنها متمانە دەکاتە سـەر هێـزی خـەیاڵ و فریـودانی عەقلە ساکارەکان و ڕەواج دان بـە مـاددەی مـردوو. ئەگـەر کەسێك ئیمـانی بـە هـەبوونی خـوا هــەبێت ئــەوە بێگومــان ئیمانیشــی بــەوە دەبێــت کــە ئــادەم لــە خــۆڵ دروسـتکرابێت چـونکە عـەقلی مـرۆڤ هـەرگیز نابێتـە پێوانـەو قیـاس بـۆ پێوانی کردارە خواییەکان.

زانست لە هەر کاتێکدا ئەگەر متمانە بکاتـە سـەر ئیلحـاد و شـەڕی خـوا بکات، یەکسەر دەست بە ووڕێنە دەکـات و کارەسـات دەخولقێنێـت، مرۆڤـی

**زانا ئەگەر بە زانستەکەی خۆی، خۆی لەوە بە گەورەتر زانی کە ئیمان بە خوا بهێنێ، ئەوە بێگومان لە لووتکەی جەهالەت و نـەزانی دایـە، چونکە زانست هەر خۆی بریتی یە لـە دۆزینـەوەی لێزانـی و کـرداره ناپابـەکانی خوا..**

**کتـێبی (تـەورات) نزیکـەی (٣٠) سـەدە بـەر لـە ئێسـاو بـەر لـەوەی کـە زانست لە دەرگای عەقلی مرۆڤایەتی بدات، زۆر بەمتمانـە بـە خۆبوونـەوە چەند دەقێکی کورتی لە (سفرالتکوین) دا خستە ڕوو کە زۆر بـە ڕاشـکاوی مرۆڤ بە دروستکراوێکی سـەر بـەخۆی بـەر دەسـتی خـوا لـە قەلـەم دەدات، دەقەکانی تەورات توانی بۆماوەی چەندین سەدە ناوبانگی خۆی بپارێزێـت و قیمەتی خۆی لەدەست نەدات، بەڵام لە سـەردەمێکدا کاتێـك ئایینزاکـانی یەهودیـەت دەسـتیان خسـتە نێـو دەقـەکان و چـەند لادان و گۆڕینێکیـان بەسەر ووشـە و ڕسـتەکاندا هێنـا، هـەر لێرەوە لێکدانـەوەکانی تـەورات لـە بارەی چۆنیەتی دروست بوونی مرۆڤ کەوتە بـەر هێرشـی ڕەخنـە و گاڵتـە پێکردنی خوێنەران، چونکە شتی وا باس دەکات کە هەرگیز لەگـەڵ عـەقل و هۆشـی مـرۆڤ ناگونجێـت. گـەورەترین هەڵـە لـەم بابەتـەدا کـە تـەوراتی ئێسـتا تیایـدا کـەوتووە ئەوەیـە کـە (سـفر التـکوین)ی تـەورات بانگەشـەی ئەوەدەکات کە خوا مرۆڤی لەسەر شێوەی خـۆی دروسـتکردووە! واتـە خـوا شـێوەیەکی وەکـو شـێوەی مرۆڤـی هەیـەو هـەمان شـێواز و ئەندامـەکانی جەستەی مرۆڤی هەیە. بە پێی ئـەم عەقیدەیـە مـرۆڤ و خـوا وەکو یـەکن لە ڕووی جەستەوە، کەواتە ئەگەر مرۆڤێك لە تەنیشت خوا دابنرێت ئـەوا ئەستەمە کە ئەم خالق و مەخلوقە لە یەکدی جیا بکرێنەوە چونکە وەکو یـەك وان، پـاش سـەردەمێك مەسـیحیەکان هەڵسـان بـە هەلگرتنـەوەو گواسـتنەوەی ئـەم بیروڕایـە بـۆ نێـو ئـایینی مەسـیحیەت، چـونکە ئـەو**

عەقیدەیـە کـە دەیـووت (مـرۆڤ لەسـەر شـێوەی خوایـە) دەبـووە بەڵگـە بـۆ بانگەشـەی مەسـیحیەکان کـە دەیـانووت عیسـا کـوڕی خوایـە، بـەڵام پـاش چەند سەدەیەك، (قورئان) دەرکەوت و زۆر بـە تونـدی ئـەم بـاوەڕەی ڕەت کـردەوەو بـە یـەکجاری بنـەبڕ کـرد لـە دەقێکـی کورتـدا کـە دەڵێـت (لـیس کمثله شيءٌ) واتە هـیچ شـتێك لـەم جیهانـەدا هاوێنـەی خـوا نییـە،،. ئـەم دەقـەی قورئـان دەتـوانرێ چـەندەها بابـەتی ئـاڵۆز و نادیـاری پـێ ڕوون بکرێتەوە بە جۆرێك کە بابەتەکە زیاتر لەگەڵ عـەقل دەگونجێـت و هـیچ هاوکێشەیەکی پێچەوانە لەسەر ناخ و بیری مرۆڤ دروست ناکات..

تەورات لەبارەی چۆنیەتی دروست بوونی یەکەم مرۆڤەوە دەڵێت:-

(وقال الله لنصنع الإنسان علي صورتنا كمثالنـا وليتسلطْ علي سمـك البحر و طير السماء والبهائم و جميع الأرض)...

تـەورات لـە چـەند دەقێکـدا بـەر لەمـە، باسـی دروسـتکردنی سـەرجەم گیانداره ئاوی و ووشکانی و باڵدارەکان و ڕووەکەکان دەکات و لەم دەقەشدا دەڵێـت ئینجـا خـوا ووتـی بـا ئێسـتا مـرۆڤ دروسـت بکـەین لەسـەر شـێوەی خۆمان وەکو ئێمە، هەروەها با ئەو مرۆڤـە دەسـت بگرێـت بەسـەر هـەموو ماسیەکانی دەریاو باڵندەکانی ئاسمان و سەرجەم ئاژەڵان و ڕووی زەوی....

بیروڕاکـانی تـەورات بـۆ مـاوەی چـەندین سـەدە تاکـە سەرچـاوەی بـیرو باوەڕەکانی خەڵکی بـوو لـە بـارەی چۆنیەتی دروسـت بـوونی مـرۆڤ، بـەڵام یاسای ڕەخنەگرتن هـەرخۆی وایـە کاتێـك زیـادەڕۆیی لـە شـتێکدا دەکرێـت یەکسـەر شمشـێری ڕەخنـە لـە هـەموو لایـەك لـە دژی تیـژ دەکرێتـەوە.. نووسەری یـەهودی ( جـول کـارلس) لـە کتـێبی (الإنسـان الأول)، لـە لاپـەڕە (٨٣) دا دەڵێـت (هەنـدێ لـە بـاوەڕداران، زۆر ئـازار دەچـێژن بـە بەشـە

**سەرەتاییەکانی (سفرالتکوین)و دەیانەوێت بە چاوپۆشی یەوە بە سەریدا تێپەڕن، لە کاتێکدا ئەو کەسانەی کە باوەڕی ئایینیان نییە، بە جددی هەوڵ دەدەن بۆ ئەوەی ناڕاستی و نابەجێیی تەورات بسەلمێنن)...**

کاتێک لە دەرگای قورئان دەچینە ژوورەوە، دەبینین لە لاپەڕە سەرەتاییەکانی قورئاندا یەکەم چیرۆک کە قورئان دەست بە گێڕانەوەی دەکات، بریتییە لە چیرۆکی چۆنیەتی دروست بوونی یەکەم مرۆڤ کە بە ئادەم ناوی دەبات، قورئان لە ڕووانگەی مرۆڤ سالارییەوە سەیری مرۆڤ دەکات و لە تەرازوویەکی مرۆڤانەدا هەڵیدەسەنگێنێت و وەکو تەورات زیادە ڕۆیی لە کەسایەتی مرۆڤ ناکات بەوەی کە بەرەو ئاستی هاووێنەیی خوا بەرزی بکاتەوە، بەڵکو بە مرۆڤێکی دروستکراوی ئاسایی وەسفی دەکات، بەڵام لە هەمان کاتدا قورئان زۆر بە توندی دژی ئەو ئایدۆلۆجیا فەلسەفیانەیە کە بنچینەو ڕەچەڵەکی مرۆڤایەتی دەگەڕێننەوە بۆ پەرەسەندنی جۆرەکانی ئاژەڵان و هەرگیز ڕێگە بەوە نادات کە مەیموونەکان بکرێنە باوکی مرۆڤایەتی بەڵکو قورئان زۆر بە ڕاشکاوی ئادەم بە باوکی مرۆڤایەتی دادەنێت و مرۆڤەکان بە نەوەی ئادەم بانگ دەکات نەک نەوەی مەیموونەکان هەروەک قورئان دەڵێت: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ إِمَّا يَأۡتِيَنَّكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾. الاعراف-۳۵- واتە: (ئەی نەوەکانی ئادەم، بێگومان چەند پەیامبەرێکتان لە خۆتانەوە بۆ دێت کە بەڵگەو نیشانەکانی منتان بەسەردا دەخوێننەوە، جا هەر کەسێک لە من بترسێت و چاکەکاری بکات، ئەوە هیچ ترسێکی لەسەر نییەو هەرگیز دڵ تەنگ نابێت.)

بانگەوازکارانی ئایدۆلۆجیای پەرەسەندن زیاتر متمانەیان دەکردە سەر لایەنــە مــاددی و جەســتەییەکەی مــرۆڤ و هــەرگیز بــە لای ڕوح دا نەدەچوون، بە پێچەوانەوەی قورئـان کە ڕوح زۆر بـەگرنگتر دادەنێت لـە جەستە ماددیەکەی مرۆڤ و بە مەرجی سەرەکی ژیانی دادەنێت،...

## تۆماری بە بەرد بووەکان و چینی کامبری

لەکاتی لێکۆڵینەوەی چینەکانی گۆی زەوی و تۆماری بەبەرد بووەکان و مێژووی ئەو گیاندارانەی کە ملیۆنەها ساڵ بەر لە ئێستا ژیاون، زۆر بە شێوازێکی ڕوون و بەڵگە نەویست ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە سەرجەم زیندەوەران و گیانداران، هەر جۆرێك بە سەربەخۆیی و لە یەك کاتدا دروستکراون. کۆنترین چینەکانی زەوی کە تاکو ئێستا نموونەی گیاندارە بەبەرد بووەکانی تێدا دۆزرابێتەوە، بریتیە لەو چینەی کە لە چاخی (کامبری)دا دروست بووە کە تەمەنی نزیکەی (٥٠٠-٥٥٠) ملیۆن ساڵ دەبێت، بە پێی چەندین لێکۆڵینەوە، دەرکەوتووە ئەو گیاندارە بە بەردبووانەی کە لە چینی سەردەمی (کامبری)دا دۆزراونەتەوە، لە کاتی خۆیدا هەموویان لە پڕێکەوە دەرکەوتوون و هیچ پێشینەی وایان بۆ نەدۆزراوەتەوە کە لەوانەوە پەرەیان سەندبێت. ئەونموونانەی کە لە نێو بەردەکانی کامبری دا دۆزراونەتەوە، گیاندارە سادە و ئاڵۆزەکان لەخۆ دەگرێت، وەکو ئیسفەنجەکان و کرمی زەوی و ماسی و بێ بڕبڕەکان و بڕبڕەدارەکان و چەندانی تر کە تێکەڵاوی و هەبوونی ئەو هەموو گیاندارە ئاڵۆزە لە یەك کاتداو لە یەك چین دا، شتێکی ئەوەندە سەر سوڕهێنەر بوو، بە جۆرێك کە جیۆلۆجیستەکان لە زاراوە زانستییە جیۆلۆجییەکاندا، ئەم دیاردەیان ناو نا بە (تەقینەوەی کامبری)، کە

لێرەدا زاراوەی (تەقینەوەی کامبری) بە مەبەستی تەقینەوەو بڵاو بوونەوەی سەرجەم جۆرەکانی گیانداران دێت لە یەك قۆناغ و چین دا کە ئەویش چینی کامبرییە. ئەو گیاندارە بەبەردبووانەی کە لەم چینەدا دۆزراونەتەوە، لە ڕووی جەستەو کۆئەندامەکانی لەشەوە، زۆر ئاڵۆز و کاملن و هیچ جیاوازیان نییە لەگەڵ هەمان جۆری گیانداری ئێستا، هەروەها ئەو گیاندارە بێ بڕبڕانەی کە لەم چاخەدا دۆزراونەتەوە، پێکهاتەیەکی ئاڵۆز و شێوازێکی جەستەیی کاملیان هەیەو هیچ پەیوەندییەك نییە لەنێوان ئەوان و ئەو زیندەوەرە تاك خانانەی کە دەووترا گیانداران لەوانەوە پەرەیان سەندووە...

(ڕیتشارد موناسترسکی) سەرنووسەری گۆڤاری (زانستی زەوی) لە بارەی تەقینەوەی کامبری دەڵێت:

**(پێش نیو بلیۆن ساڵ (٥٠٠) ملیۆن ساڵ، لە یەك کاتدا سەرجەم گیانداران بە پێکهاتەیەکی جەستەیی ئاڵۆز و کامل دروست کران بە جۆرێك کە لەگەڵ گیاندارانی ئێستا هیچ جیاوازیان نییە، هەروەها چاخی کامبری واتا (٥٥٠) ملیۆن ساڵ پێش ئێستا، یەکەم خاڵی تەقینەوەی ژیان بوو کە سەرجەم دەریا و ووشکانییەکانی پڕ کرد لە گیاندار، ئەو هۆزە گیاندارەی کە ئێستا دەیان بینین، هەر ئەوانەن کە لەو سەردەمەدا هەبوون)..**

لە چاخی (کامبری) دا، چەندەها جۆری ئاڵۆزی گیاندار دەبینین، لە کاتێکدا کە ئەم چینە کۆنترین چینی جیۆلیۆجییە و گیانداری بەبەردبووی لەمانە کۆنتر تا ئێستا نەدۆزراوەتەوە، ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر ڕاست بووایە کە گیانداران بە پەرەسەندن بە چەند قۆناغێك لە

یەکترییەوە دروست بوون، دەبوایە چینێکی تری کۆنتر هەبوایەو سەرجەم گیانداره پێشینەکانی تیا بدۆزرابایەوە کە سەرچاوەی دروست بوونی گیاندارانی چینی کامبرین و لێیانەوە پەرەیان سەندووە.

زانای بواری ئاژەڵناسی (ریتشارد داوکتر) لەم بارەیەوە دەڵێت:

**(چینە بەردییەکانی کامبری، کۆنترین چینی جیۆلۆجییە کە تیایدا گیاندارە بێ بڕبڕە بەبەردبووەکانی تێدا دۆزرابێتەوە، لە کاتێکدا ئەو گیاندارانە لە ڕووی جەستەو پێکهاتنەوە، زۆر ئاڵۆز و پێشکەوتوون، بەڕاستی وا دیارە کە لەو قۆناغەدا، یەکسەر ئەو گیاندارانە دەرکەوتوون بەبێ ئەوەی کە بە هیچ هەنگاوێکی گۆڕان و پەرەسەندن دا بڕۆن)..**

زانایانی پەرەسەندن دەڵێن لە سەرەتادا خانەیەك یان تەنێکی ئەندامی پەرەی سەندووەو زیندەوەرێکی سادەو سەرەتایی لێ دروست بووەو ئەو زیندەوەرەش هەر پەرەی سەندووە تاوەکو گشت جۆرەکانی گیاندارانی لێ دروست بووە تاوەکو گەیشتۆتە قۆناغی دروست بوونی مەیموون و ئینجا مرۆڤ، ئێمە لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەگەر ئەم بیروڕایەی پەرەسەندن ڕاستیش بێت، خۆ زینگە تەنها دەتوانێت خانەکە بگۆڕێت بۆ یەك زیندەوەر، واتە یەك دانە، بەڵام بۆچی لە کۆنترین چینی زەوی دا و لە دوورترین مێژووی گۆی زەوی و ژیان دا، هەر هەموو جۆرەکانی گیانداران و باڵداران و زیندەوەران بە هەزارەها جۆرو ملیۆنەها دانە، بوونیان هەبووەو دۆزراونەتەوە؟!..

بەم جۆرە دەبینین کە تۆماری بەبەرد بووەکان و دۆزراوەکانی نێو چینی (کامبری) دەبێتە گەورەترین کێشە لەبەردەم تیۆری پەرەسەندن و داروینییەکان هەرگیز نەیانتوانیوە وەڵامێکی مەنتیقیانەی ئەم بابەتە

**بدەنــەوە هــەروەك دەبیــنین کــە نووســەری عــەرەبی (سلامة موسی) کــە پشتیوانێکی سەرسەختی بیردۆزی پەرەسەندنە لەکتێبی (نظریـة التطور وأصـل الإنسـان) دا لــە دان پیانانێکــدا دەڵێــت: (یــەکێك لــەو کۆســپ و تەگەرانــەی کــە توێژینــەوەمان لــە بــەردەم قــورس دەکــات، ئەوەیــە کــە چینەکانی زەوی فریامان ناکەوێت بە بەڵگەی زانستی)!.**

## یاساکانی داینامیکی گەرمی

یاساکانی داینامیکی گەرمی بە گرنگترین یاسا فیزیاوییەکان دادەنرێت کە بە چەند یاسایەکی فیزیاوی هەوڵی ڕوونکردنەوەی بارەکانی ماددە دەدات لە سروشت دا، یاسای دووەمی داینامیکی گەرمی کە بە (ئەنترۆپیا) ناسراوە گەورەترین ئاستەنگی خستۆتە بەردەم پەرەسەندن و هەرگیز ئەفسانە و بانگەشەکانی پەرەسەندن لەگەڵ دەقی ئەم یاسایە ناگونجێت، دەقی یاسای دووەمی داینامیکی گەرمی دەڵێت:

**(هەر شتێك یاخود هەر ماددەیەك، زیندوو بێت یان مردوو، ئەگەر هێزێکی دەرەکی کاری تێنەکات و سەرپەرشتی نەکات، ئەوە ئەو شتە بەرە بەرە بە تێپەڕ بوونی زەمەن و کات، کۆن دەبێت و تێکدەچێت و دواتر لەناو دەچێت و نامێنێت)**، واتە هەموو بوونەوەرێکی زیندوو یان ماددەی مردوو بەپێی ئەم یاسا فیزیاوییە، ئەگەر هێزێکی سەرووی خۆی سەرپەرشتی نەکات و نەیپارێزێت، ئەوە لەژێر بارەکانی سروشتدا هەرگیز خۆی ڕاناگرێت و بەرە بەرە تێکدەچێ و لەناودەچێت، بۆ نموونە ئەگەر سەیارەیەك فڕێ بدەینە بیابانێك و بۆماوەی چەند ساڵێك لەوێ بێ خاوەن جێ بهێڵرێت و کەس دەستکاری نەکات، پاش چەند ساڵێك دەبینین سەیارەکە جامی شکاوە ژەنگی هەڵێناوە تایەکانی تێکچوون و

چـەند پارچـەیەکی لـێ بۆتـەوەو خەریکـە بـەرەو نـەمان دەچـێت، یـان خانووێك ئەگەر بێ خاوەن بێت، دەبینین بەرە بەرە کۆن دەبێت و دەبێتە کـەلاوەو دەڕووخێـت و تـا لـە دواییـدا نامێنێـت، بـەڵام ئەگـەر خـاوەنێکی هـەبێت کـە سەرپەرشـتی بکـات و ئاگـاداری بێـت، بێگومـان ئـەم حاڵەتـە هـەرگیز ڕوونـادات.. کەواتـە لێـرەدا ڕاسـتەقینەیەکی زۆر سەرسـوڕهێنەر بەڕوونی ئاشکرا دەبێت ئەویش ئەوەیە کـە گـەردوون و زەوی و گیانـداران هەرگیز بە پەرەسەندن و ڕێکەوت و بێ خاوەنی دروست نـەبوون، چونکە ئەگەر وا بووایـە ئـەوا بـەپێی یاسـای دووەمـی داینـامیکی گـەرمی، دەبوایـە گـەردوون و بوونـەوەران بـە تێپـەڕ بـوونی کـات لەناوچـووبان و نـەمابان چونکە بـیردۆزی پەرمسـەندن ڕێکـەوتی خـەیاڵی و درۆیـی کردۆتـە کـارای دەرکـەوتنی بوونـەوەران و هـەرگیز دان بـەهێزی خـوا نانێـت وەکـو هێـزی باڵای خاوەن و سەرپەرشتی کارو ئاگادار،

بینیمان کە خانووێك بە بێ خاوەنی و ئاگاداری، تێکچوو و نـەما، ئـەی ئەو هـەموو نەخشەسـازی و جوانکارییـەی کـە لـە بوونـەوەر و گیاندارانـدا هەیە، چۆن دەکرێ بە بێ خاوەنی ملیارەها ساڵ بمێنێتەوە و هەر لە نـوێ بوونەوەو جوان بوون دابێت؟

بیردۆزی پەرمسەندن زۆر بە کوێرانـە ئـەم یاسـایەی فـەرامۆش کـردووە لە کاتێکدا کە بە ترسناکترین و مەترسیدارترین یاسای زانستی و فیزیـاوی دادەنرێت دژی پەرەسەندن و سـەد لەسـەد پێچەوانەی پەرمسـەندنمان بـۆ دەسـەلێنێت. بـیردۆزی پەرمسـەندن ڕای وایـە کـە ئـەم هـەموو سیسـتەمە ئاڵۆزانەی بوونەوەر وەکو گەردیلـە و خانـە و مەجـەڕڕەکان و هەسـارەکان و سـەرجەم گیانــداران، هــەردەم لــە پەرمســەندن دان بــەرەو پێشــەوەو

دەگۆڕێن بۆ جۆری تری نوێ بە کاریگەری سروشت، بەلام یاسای دووەمی داینامیکی گەرمی، کە یاسایەکی دان پیانراو و سەلمێنراوی زانستییە لە فیزیادا، ئەم بیروباوەڕە بە تەواوی بەدرۆ دەخاتەوەو دەڵێت هەر هەموو شتێك زیندوو بێت یان مردوو، ئەگەر هێزێکی کارای دەرەکی تێنەکات و نەیپارێزێت، تێکدەچێت و لەناو دەچێت.

هەروەها بە پێی ئەم یاسایە، کارای (ئەنترۆپیا) ڕاستەوانە زیاد دەکات لە هەر کاتێکدا ئەگەر سیستەمێك لە نەخشە بۆکێشراوی و خاوەندارییەوە گۆڕا بۆ سیستەمێکی هەڕەمەکی و بێ خاوەن... زەربەی ئەم یاسایە زۆر بە ڕوونی بەسەر لاشەی بیردۆزی پەرەسەندنەوە دیاربوو بە جۆرێك کە لایەنگرانی پەرەسەندن نەیاندەتوانی ئینکاری بکەن، هەروەك دەبینین کە (روگر لیوبن) لەدان پیانانێکی ڕاشکاودا دەڵێت:

(یەکێك لەو کێشە گەورانەی کە زانایان ڕووبەڕووی بوونەتەوە، بریتی یە لە نەگونجان و پێچەوانەی یەکتر بوونی نێوان بیردۆزی پەرەسەندن و یاسای دووەمی داینامیکی گەرمی، چونکە سیستەمەکان_مردووبێت یان زیندوو_ بەرە بەرە تێکچوونی بەسەر دادێت تاوەکو دەگاتە ئاستی سادەیی و لەناو چوون نەك پەرەسەندن بەرەو پێشەوە هەروەك بیردۆزەکە وای بۆدەچێت!)..

## پێکهاتەو فرمانی خانە

لەو سەردەمەی کە داروینی تیا دەژیا، ئاستی زانستی لەبارەی پێکهاتەو فرمانی خانەی زیندوو زۆرکەم بوو، بەلام لە سەرەتای سەدەی بیستەم دا، کاتێك پێکهاتەو فرمانە سەرەکییەکانی خانە دەرکەوت، ئەم دۆزینەوەیە گەورەترین زەبری کوشندەی لە تیۆری پەرەسەندن دا، خانە یەکەی

دروستبوونی گیاندارەو هەر خانەیەك نموونەی گیانداریکی تەواو دەنوێنێت و زیاتر لە (١٠) بەش پێکدێت وەکو مایتۆکۆندریا و گەردی (دی ئێن ئەی) و لایسۆسۆم و دەزگای گۆلجی و ناوك و پەردەکان و هتد..

مایتۆکۆندریاو گەردی (دی ئێن ئەی)، ئالۆزترین و سەرسوڕهێنەرترین بەشی خانەن لە ڕووی پێکهاتن و فرمانەوە، مایتۆکۆندریا لە خانەدا مەڵبەندی سەرەکی دابین کردنی ووزەیە بۆ لەش، هەروەها لە ڕووی قەبارەوە ئەوەندە بچووکە، ئەگەر هەزارەها دانەی لێ ڕوو بکەینە سەر کاغەزێك، لە مەودای ٣سم دا جێگەیان دەبێتەوە. لەکاتی سەیرکردنی شتێکدا بۆ بینینی، چاوی مرۆڤ ئەو دیمەنە وەکو هێمایەکی کارەبایی دەگوازێتەوە بۆ دەماغ کە لەم کرداری گواستنەوەیەدا (٢٥٠) ملیۆن خانە توانا کارەباییەکانیان بەکار دەهێنن تاوەکو دیمەنەکە لەلایەن مرۆڤەوە ببینرێ، مایتۆکۆندریا لە هەر خانەیەکدا دروستکەر و دابینکەری ئەو ووزەیە، هەروەها مایتۆکۆندریا لەگەڵ بچوکیەکەی خۆیدا، (١٥) هەزار جۆری ئەنزیم لەخۆ دەگرێت کە لە هەموویانەوە ووزەی پێویست بەرهەم دێنێت بۆ جوولەو کارکردن و خوێندنەوەو کاروبارەکانی تری مرۆڤ یان ئاژەڵ..

بەڵام با ئەوەش بزانین کە مایتۆکۆندریا ئالۆزترین و سەیرترین بەشی خانە نییە، بەڵکو ئەو بەشەی خانە کە زۆر سەیرو سەرسوڕهێنەرە بریتییە لە گەردەکانی (دی ئێن ئەی) کە لە ناوکی خانەدا هەن، دۆزینەوەی گەردەکانی (دی ئێن ئەی) بە گەورەترین دۆزینەوەی زانستی و بایۆلۆجی دادەنرێت لە جیهاندا. گەردەکانی (دی ئێن ئەی) لە ڕووی درێژیەوە زۆر درێژن بەجۆرێك کە درێژی یەك دانە زۆر لە درێژی باڵای

مـرۆڤ زیـاترە. هـەروەها ئەوەنـدە زۆرن کـە ئەگـەر گـەردەکانی (دی ئـێن ئەی) نـاو لەشـی یـەك مـرۆڤ بەیەکەوە ببەستینەوە، ڕەنگـە درێژییەکـەی چەندین جار لە مەودای نێوان زەوی و خۆر زیاتر بێت!.

بـەڵام ئـەم گەردانـە هـەموویان لـە نـاوکی خانـەدا بـە لـوول پێچـی و بەناویـەك داچـوون هـەلگیراون کـە خانەکـە هـەر بـە چـاویش نابینـرێـت ئەوەنـدە ووردو بچوکە!.

کـارو فرمـانی ئـەو گەردانـە زۆر سـەیرترە لـە پێکهاتـەیان، گـەردی (دی ئێن ئـەی) پێـی دەووتـرێ (کۆگـای زانیارییـەکان) چـونکە گشـت سـیفات و زانیارییـە جەسـتەییەکانی مـرۆڤ لەسـەر شـریتەکانی ئـەم گەردانـەدا هـەلگیراون و خـەزن کـراون ، بـۆ نموونـە ڕەنگـی چـاو یـان پێسـت یـاخود درێژی باڵا یـان ئاسـتی دەنـگ و زیرەکـی و تەنانـەت زانیارییـە ووردەکـانی وەکو هێڵە نەخشەییەکانی پەنجەمۆری دەسـتی مـرۆڤ، بـۆ نموونـە ئەگـەر مرۆڤێك چاوی شین بێت، ئەوا گەردەکانی (دی ئێن ئەی) زانیاری ئەومیان تیا هەلگیراوە کە ئەو مرۆڤە چاوی شینە یان باڵای بـەرزە یـان کورتـە یـان هـەر نەخۆشـیـەکی بۆمـاوەیی ئەگـەر لـە کەسـەکە دا هـەبێت لەسـەر گەردەکانـدا تۆمـار کـراوە، ئـەم سـیفەت و زانیارییـە هەلگیراوانـەی نێـو شریتەکانی (دی ئێن ئەی) بە بۆماوەیی بۆ منالەکان دەگوازرێتـەوە بـە تێکەڵ بوونی خانەی نێرینەو مێینە کە خانەیەکی پیتراو دروست دەبێت کـە (٤٦) کرۆموسـۆم لـەخۆ دەگرێـت، کـە دوو دانـەیان بەرپرسـن لـە دیاریکردنی ڕەگەزی کۆرپەلەو ئەوانی تـریش هەڵدەسـتن بـە گواسـتنەوەی سیفاتە جەستەیی و غەریزییەکانی دوو باوانەکە بۆ منالەکە، ئـەو سـەیرو سەمەرەو نەخشە سازییە ئالۆزەی نێو یەك خانە هەمووی نییە، بـەلکو تـا

ئێسا شتێکی زۆر کەم باسکراوە لە بارەیەوە، جا ئایا دەکرێ شتێکی وا ئاڵۆز و ناوازە لە دەرئەنجامی ڕێکەوت و هەڵبژاردنی سروشتییەوە دروست ببێت؟ بێگومان نەخێر، بەڵکو لەنێو جەرگەی وێڵی و دەستەوسانیمان لە ئاست وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە، ناچارین کە هانا ببەینە بەر ئەم وتەیەی (أحسن الخالقين) کە دەفەرمووێت ﴿صنع الله الذي أتقن كلّ شيء﴾، خانە دەبێت هەر هەموو بەشەکانی لە یەك کاتدا و بەیەکەوە بوونیان هەبێت و تەواو بن ئەگینا ئەگەر یەکێك لە بەشەکانی بوونی نەبوو، ئەوە یەکسەر خانەکە لەناو دەچێت و دەمرێت، بەڵام ئەگەر ڕاست بێت کە خانە بەهۆی کارای هەڵبژاردنی سروشتییەوە دروست بووبێت بەرە بەرە، ئەوە بێگومان ئەم جۆرە دروست بوونە بە کاملی و تەواوی نابێت، بەڵکو لە سەردەمێکدا ڕەنگە تەنها دوو بەشی لێ دروست بووبێت و ئینجا بەرە بەرە پەرە بسەنێت بۆ دروست بوونی بەشەکانی تر، چونکە پەرەسەندن واتە دروست بوونی بەرە بەرە و قۆناغ بە قۆناغ، بەڵام ئەم جۆرە دروست بوونە هەرگیز بۆ خانە نابێت، چونکە خانە ئەگەر بەشێکی لێ کەم بێت یەکسەر لەناو دەچێت، بەڵکو دەبێت سەرجەم بەشەکانی بە تەواوی و لە یەك کاتدا بوونیان هەبێت تاوەکو خانە لەناو دەچێت.

زاناکانی بواری خانەزانی (علم الخلايا) دەریان خستووە کە ئەگەر ئەو زانیارییانەی لەناو گەردەکانی (دی ئێن ئەی) ناو یەك خانەی لەشی مرۆڤ دا هەڵگیراون بە نووسین بنوسرێنەوە، ئەوەندەی گەورەترین کتێبخانەی جیهان کتێبی لێ دروست دەبێت، ئینسایکلۆپیدیای بەریتانی کە گەورەترین کۆکراوەی زانیارییە لە جیهاندا، نزیکەی (٤٠) هەزار لاپەڕە دەبێت بە جۆرێك کە زانیاری سەرجەم بوارەکانی تێدا نووسراوەتەوە،

کەچی شریتەکانی گەردی (دی ئێن ئەی) ناو یەك خانە، بە بڕی یەك ملیۆن لاپەڕە زانیاری تیا هەڵگیراوە کە ئەو زانیارییە ووردو زۆرانە هەر لە سنوری بیرکردنەوەی مرۆڤیشدا نییەو هەمووی لە ناوکی خانەدا کۆ بۆتەوەو خانەکە هەر بە چاویش نابینرێت!

ئەگەر ڕامان وابێت کە ئەم گەردانە و زانیارییەکانی ناویان بە کاریگەری هەڵبژاردنی سروشتی و ڕێکەوت بەم جۆرە خەزن کراون و ڕیز بوون، ئەوە وەك ئەوە وایە کە بڵێین کتێبخانەکانی جیهان لەخۆیانەوە بە ڕێکەوت دروست بوون و کتێبەکانیش هەر لەخۆیانەوە بە ڕیزبەندێکی ناوازە ڕیز بوون لەنێو ڕەفەکان!

ژمارەی خانەکانی لەشی مرۆڤێك نزیکەی (٦٠) هەزار ملیار خانە دەبێت کە هەر خانەیەك کارو فرمانی سەربەخۆیەو لە هەر یەك لە خانەکانداو لەچەقیدا ناوك هەیەو گەردەکانی (دی ئێن ئەی) دەکەونە ناوکی خانە، هەر خانەیەکیش پێکدێت لە مایتۆکۆندریاو ڕایبۆسۆم و تەنۆچکەی گۆڵجی و سایتۆپلازم و تۆڕی کرۆماتینی و پەردەی ناوەوەو دەرەوەو شلەکان، کە ئەم بەشانە لە ئەنجام دانی کارەکانیاندا هەماهەنگی و پەیوەندییەکی پتەو لە نێوانیاندا هەیە کە هەروەك پێشتر ووتمان مەرجە ئەم بەشانە هەر هەموویان بەیەکەوە لەیەك کاتدا دروست ببن بۆ نەمردنی خانەکە، کە ئەمە بە تەواوی دژی بیروڕای پەرەسەندن دەوەستێتەوە، چونکە پەرەسەندن بانگەشەی دروست بوونی بەرە بەرەو بەش بەشی ئەندامەکان دەکات کە خانە بەجۆرە دروست بوونێکی لەم چەشنە، هەر لە سەرەتاداو لە بێشکەدا دەمرێت!!..

پسپۆرانی بواری خانەزانی لە توێژینەوەکانیاندا گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە ئەو کارو فرمانانەی لە ناو یەك خانەی زیندوودا بەڕێوە دەچن، زۆر ئاڵۆزتر و سەیرترە لەو ئیش و کارانەی کە لە نێو شارێکی گەورەدا بەڕێوە دەچن،

ئیش و کارو چالاکیەکانی ناو یەك خانە وەکو شارێك وایە کە ئەو شارە شورای بەرز و پتەوی بە دەورەوە بێت و چالاکیەکانی شارەوانی هەردەم بەردەوام بێت لەو شارەداو کاروبارە ئیدارییەکان بە ڕێکی تیادا بچێت بەڕێوە، هەروەها لەو شارەدا، سەدان وێستگەی بەرهەم هێنانی ووزە کاربکات و هۆکارەکانی گواستنەوەو گەیاندن هەردەم لە کارکردن دابێت، لەو شارەدا ژووری کارگێڕی و تۆڕەکانی پەیوەندی و هەواڵگری و بنکەکانی دابەشکردنی خۆراك و ماددەی خاوو خاوێنکەرەوەکان و فڕێدانی پاشماوەکان هەمووی بەیەکەوە کاربکەن بێ ئەوەی هیچیان کاری ئەوی تریان تێك بدات بەڵکو یارمەتی یەکتریش بدەن، هەروەها چوونە ژوورەوە و هاتنە دەرەوەی ئەم شارە لەژێر چاودێرییەکی توند دابێت. هەروەها لەو شارەدا، گەورەترین کتێبخانە هەبێت کە هەزارەها کتێبی وەکو بانکی زانیاری تیا هەڵگیرابێت...

بێگومان ئیش و کارەکانی ناو یەك خانەی زیندوو، زۆر ئاڵۆزترە لە چالاکیەکانی نێو شارێکی گەورە، چونکە لەناو خانەدا، سەرجەم کردارەکانی وەکو بەرهەم هێنانی ووزەو فڕێدانی پاشەڕۆ و پەیوەندی نێوان بەشەکان و نوێ کردنەوەی ئەندامەکانی لەش و بەرگری کردن لە هاتنە ناوەوەی تەنی زیان بەخش و هەڵگرتنی گشت زانیاریە لاشەییەکانی مرۆڤ و چەندان کرداری سەیرتری لەم جۆرە، زۆر بە ڕێکی دەڕوات

بەرێوەو ئەگەر خانەکانی هەر ئەندامێکی لەش توانای کەم بکات، یەکسەر خانەکانی ئەندامەکانی تر بەهانای دێن و کۆمەکی دەکەن، جا ئەوەی کە جێگەی ووتنە ئەوەیە کە بە چ بەڵگە و پێوەرێك دەگونجێت خانەیەکی وا کە زانیارییەکانی ناوی بە زانیارییەکانی ناو چەندین کتێبی گەورە بخەملێنرێ و ئیش و کارەکانی زۆر رێك و پێك ترو ئاڵۆزتربێت لە کارو بارەکانی نێو شارێکی گەورە، سەرەتای دروست بوون و دەرکەوتنی بگەڕێنرێتەوە بۆ کاریگەری هەڵبژاردنی سروشتی و ڕێکەوتی کوێرانەو خەیاڵی بە جۆرێك کە خانە زۆر لە سروشتی مردوو ئاڵۆزترو بەهرەدارترە؟!..

زاناو پرۆفیسۆری پایەبەرزی تورکی (عدنان أوکطار) کە بە (هارون یحیی) ناسراوەو یەکێکە لە گەورەترین نووسەرە ڕەخنەگرەکانی جیهان لە دژی داروینیەت و تیۆرە ئیلحادیەکان لەم بارەیەوە دەڵێت:

(گشت لقەکانی زانست وەکو بۆماوەزانی و کیمیای ئەندامی و بایۆلوجی گەردیلەیی، دژی ئەوەن کە ژیان بەڕێکەوت دروست بووبێت، یان بە کاریگەری هۆکارە سروشتییەکان لەخۆیەوە پەیدا بووبێت، وە لە ناوەندە زانستی یەکانـدا بابەتێکی سەرەکی هەیە ئەویش ئەوەیە کە پێکهاتەی خانەی زیندوو ئاڵۆزترین پێکهاتەیە کە تاوەکو ئێستا مرۆڤ بەرچاوی کەوتبێ، زانستی نوێ دەریخستووە کە ئەو ئاڵۆزییەی لەکارو چالاکیەکانی خانەیەکی زیندوودا دەبینرێت، زۆر ئاڵۆزترە لەو هەموو کارکردن و ئاڵۆزییانەی کە لە شارێکی گەورەدا دەبینرێت، پێکهاتەی ئەو خانەیە توانای کارکردنی نییە تەنها ئەگەر بەشەکانی لە یەك کاتدا پێکەوە دروست بووبن بە تەواوترین شێوە، ئەگەر نا ئەو خانەیە بە

**تێپەڕبوونی کات لەناو دەچێت، بۆیە ناکرێت بڵێین ئەو پێکهاتە ئاڵۆزەی خانەی زیندوو بە ڕێکەوت دروست بووە هەنگاو بە هەنگاو و بە ملیۆنەها ساڵ هەروەك بیردۆزی پەرەسەندن وای بۆدەچێت..)..**

## پێوانەی زەمەنیی پەرەسەندن و تەمەنی زەوی بە یاسای ( فیساگۆرس ) ی بیرکاری

**سەرەڕای ئەوەی کە بیردۆزی پەرەسەندن بەرامبەر گشت زانستە بایۆلۆجی و لقەکانی زانستی ژیان ناسی و سروشتناسی و ئەنثرۆپۆلۆجیاو خانەزانی و جیۆلۆجیاو بۆماوەزانیدا شکستی هێناوە و نەیتوانیوە خۆی ڕابگرێت بەرامبەر بەڵگە زانستییە ڕاستەقینەکان، دەبینین کە ئەم تیۆرە گەورەترین هەرەس و شکست دەهێنێت بەرامبەر یاسایەکی بە ناوبانگی بیرکاری کە ئەویش ڕێسای سێگۆشەی گۆشە وەستاوی ناسراو بە یاسای (فیساگۆرس)ە.**

**سێگۆشەی گۆشە وەستاو پێکدێت لە دوو لای یەکسان لەگەڵ لایەکی تر کە سەری دوو لا یەکسانەکە بە یەك دەگەیەنێ و پێی دەووترێ (ژێ)،.. بە پێی یاسای فیساگۆرس دەبێت سەرجەمی دووجای دوو لا یەکسانەکە یەکسان بێت بە دووجای (ژێ) تاوەکو سێگۆشەیەکی گۆشە (٩٠) ی وەستاو بەتەواوی دەربچێت، ئەگینا شێوەی سێگۆشەکە تێکدەچێت، ئێستا با وێنەی هێلکاری سێگۆشەکە وەربگرین ئینجا لە ژێر نیگای ئەم ڕێسایەی بیرکاریەوە تیشکێکی ڕەخنەیی بخەینە سەر تیۆری پەرەسەندن،**

***دەقی یاساکە***

***(دووجای {أ ب}) + (دووجای {أ ج}) = (دووجای {ژێ})***




***هەروەك لە هێلکارییەکەدا دیارە کە لە پێناو دەرچوونی (ژێ) بە تــەواوی و بــە درێژییــەکی پێوانەیی، ئەوا مەرجە پێوانەی دوو لا وەستاوەکە یەکسان بێت، ئەگەر نا (رووی لێژ) ی ژێیەکە تێکدەچێت، کەواتــە ئەگــەر لێــرەدا پێوانــەی (ژێ) رووودانــی کــرداری پەرەســەندن بنوێنێت، ئەوا مەرجە کە ئەو دوو پێوانەیەی بۆ دوو لا وەستاوەکە دیاری دەکەین یەکسان بن.***

کەواتە دیارترین خاسیەتەکانی سێگۆشەی گۆشە وەستاو ئەوەیە کە دەبێت پێوانەی دوولا وەستاوەکە یەکسان بێت بۆ ئەوەی بە پێی یاسای فیساگۆرس پێوانەی (ژێ) بدۆزرێتەوە بە جۆرێك ئەگەر پێوانەی یەکێك لە دوولا وەستاوەکە تۆزێك کەمتر یان زیاتر بێت لەوەی تر، ئەوا شێوەی سێگۆشەکە تێك دەچێت و بەرەو گۆشەی کراوە یان تیژ دەڕوات، ئێستا ئێمە با بیبین لە ژێر تیشکی ڕێسای فیساگۆرسی بیرکاری ئەوە ڕوون بکەینەوە کە ئایا ئەو(کات)ەی کە پەرەسەندن خایاندویەتی لە نێوان یەکەم زیندەوەر تاوەکو گەیشتۆتە مرۆڤ، لەگەڵ تەمەنی گۆی زەوی یەکسانە یان نا؟.

بێگومان گۆڕانی گیاندارێك بۆ گیاندارێکی تر، کاتێکی ئەوەندە خەیاڵی دەوێت کە دەبێت بەملیارەها ملیار ساڵ بخەملێنرێت،

بیردۆزی پەرەسەندن ڕای وایە کە گۆی زەوی لە سەرەتادا هیچ زیندەوەر و گیانداریکی لە سەر نەبووە، پاشان بە ڕیکەوت و بە هۆی کارتیاکەرە ژینگەییەکان، زیندەوەریکی ووردو سادەو ساکار پەیدا بوو لە تەنیکی مردووی ژیر خاکە شیدار و ئەندامیەکان، پاشان بەرە بەرە ئەم زیندەوەرە پەرەی سەندو گۆڕا بۆ جۆری ترو بەم جۆرە پەرەسەندن هەر بەردەوام بووەو قۆناغ دوای قۆناغ جۆری گیانداری نوێ لە جۆری پیش خۆیەوە دروست بووەو تاوەکو لە دوا پایەدا مرۆڤ و مەیموون لە یەك باوانەوە دروست بوون، ئەم ناوەرۆکە ئەفسووناوییەی تیۆری پەرەسەندن، بە نووسین و قسە زۆر ئاسانە، بەلام کرداریکی وا لەسەرخۆو هیواشی وەك ئەوەی کە چەندەها ملیۆن ساڵ زەوی هیچی لە سەر نەبووبیت و پاشان زیندەوەریك لە خۆیەوە دروست بووبیت و ئینجا قۆناغ بە قۆناغ ئەو هەزارەها جۆرەی گیانداران و زیندەوەران و باڵداران دروست بووبن لە ئەنجامی پەرەسەندن و گۆڕانی بەردەوامی ئەو زیندەوەرەوە، ئەوە بێگومان کاتیکی ئەوەندە زۆری دەویت کە ڕەنگە بە چەندەها ملیار یان تریلیۆن ساڵ تەواو نەبیت ئەوە لە کاتیکدا کە تەمەنی گۆی زەوی بە پێی گشت توێژینەوە جیۆلۆجی و دەرخستنە زانستییەکان یەك ملیار ساڵ نابیت، بەڵکو تەمەنی گۆی زەوی تاوەکو ئێستا لە لایەن زانایانی زەوی ناسییەوە بە (٥٠٠) ملیۆن ساڵ خەملێنراوە، کەواتە ئەو کات و زەمەنەی کە پەرەسەندن دەیخایەنێت زۆر جیاوازو دوورە لەگەڵ تەمەنی گۆی زەوی و مێژووی دەرکەوتنی.

جا ئێمە ئەگەر لە پێوانەی دوولا وەستاوەکەی سێگۆشەی گۆشە وەستاودا، ئەو کاتە وەربگرین کە پەرەسەندن خایاندویەتی بۆ لایەك و بۆ لایەکەی تریش تەمەنی زەوی، ئەوە بێگومان بە پێی یاسای

فیساگۆرسی بیرکاری (ژێ)ی سێگۆشەکە دەرناچێت و شێوەی سێگۆشەکە تێك دەچێت بەم شێوەیە:




کەواتە پێوانەی دوو لا وەستاوەکە یەکسان نییەو بەمەش بە پێی ڕێسای فیساگۆرس، سێگۆشەکە تێك دەچێ و پێوانەی (ژێ) دەرناچێت کە لێرەدا ژێی سێگۆشەکە بەڕێوە چوون و ڕوودانی کرداری پەرەسەندن دەنوێنێت، بە پێی ئەم یاسایە ئەو دوو لایەی کە (کۆ) دەکرێنەوە، پێویستە یەکسان بن بەلام تەمەنی گۆی زەوی زۆر کەمترە لەو زەمەن و کاتەی کە پەرەسەندن خایاندویەتی، بەمەش دەردەکەوێ کە تیۆری پەرەسەندن بەرامبەر سادەترین یاسای بیرکاری کە یاسای (فیساگۆرس)ە بە تەواوی دادەڕووخێت و نرخی نامێنێت.

## گرنگترین ئەو هەڵوێستە ڕەخنەییانەی کە لە سەرەنجامدا دەتوانین وەریان بگرین لە سەر تیۆری پەرەسەندن، دەتوانین لە چەند خاڵێکدا دەریان ببڕین بەم شێوەیە :

١- بیردۆزی پەرەسەندن هیچ بنـەماو پێگـەو ئامـانجێکی زانسـتی نـەبوو، بەڵکو تەنها فکرمیەکی فەلسەفی ئیلحادی بوو کە ماددییەکان بۆ سـەپاندنی جیهانێکی دوور لە ئایین بەرگریان لێ دەکرد...

٢- ئەم بیردۆزە تەنها بیروڕایەکی گریمانییەو تا ئێستا وەکو ڕاسـتییەکی زانسـتی نەسـەلمێنراوەو دانـی پیانـەنراوە. واتـە تـا ئێسـتا هـەر خـەیاڵ و گریمانە...

٣- بیردۆزی پەرەسەندن سەرچاوەی زۆرێك لەو شـەڕو جـەنگ و تونـدو تیژیانەی سەرەتای سەدەی بیستەم بوو، چونکە فکرەی (ململانێ لە پێنـاو مانەوە) کە داروین باسی دەکرد، وەکو عەقیدەیەکی خوێناوی زاڵ ببوو بە سەر بیرو باوەڕی دەسەڵاتدارانی ئەوروپای ئەو کاتە....

٤- ئەم بیردۆزە بووە هۆی کـەم کردنـەوەی ڕێـزو قیمـەت و پلـەو پایـەی مرۆڤ چونکە ڕەچەڵەك و بناغەکەی گێڕایـەوە بـۆ سـەر ئـاژەڵان کـە هـەر خۆی لە خۆیدا ئاژەڵان بۆ خزمەتی مرۆڤ تەسخیر کراون...

٥- ئەم بیردۆزە گەورەترین فاکتەر بوو بۆ نەهێشتنی ئـەخلاق و ئاکـارە جوانەکان، چونکە مرۆڤـی هێنـابووە ڕیـزی ئـاژەڵان و بـە نـەوەی ئـاژەڵانی دادەناو فکرەی هەبوونی خوای فەرامۆش کردبوو، جا لێـرەدا مـرۆڤ کاتێـك

دەبینێت ئەوەی ئاژەڵانە، بۆیە هەست دەکات کە وەکو ئاژەڵ هیچ بەربەستێکی لە بەردەم نییە بۆ تێر کردنی حەزەکانی.

٦- ئەم بیردۆزە تا ئێستا نەیتوانیوە ڕوون کردنەوەیەکی سەرکەوتوو لەبارەی چۆنیەتی و سەرەتای دروست بوونی ژیان بخاتە ڕوو...

٧- ئەم بیردۆزە زۆر بە سەختی شکست دەهێنێت و ناتوانێت چۆنیەتی دروست بوونی غەریزە ڕوحی و هۆشیارو زیرەکەکانی گیانداران ڕوون بکاتەوە....

٨- تۆماری بەبەردبووەکان زۆر بە ڕوونی و ئاشکرایی ئەم بیردۆزە ڕەت دەکاتەوەو بەلگەکانی بە درۆ دەخاتەوە...

٩- داروین لە کتێبەکەیدا، زۆر بە ڕاشکاوی دان بەوەدا دەنێت کە بیردۆزی پەرەسەندن ناتوانێت ئەوە ڕوون بکاتەوە کە ئایا (هەنگ) ئەو ئەندازە ناوازەیە چۆن فێر بووە لە دروستکردنی شانەکانیدا...

١٠- چوار بناغەکەی پەرەسەندن (هەڵبژاردنی سروشتی،، ململانێ لە پێناو مانەوە،، بۆماوە،، خۆگونجاندنی ژینگەیی)، هەرگیز زانستی و مەنتیقی نین و تا ئێستا نەسەلێنراون و نابنە هۆکاری هیچ گۆڕان و پەرەسەندنێك...

١١- ڕێکەوت (الصدفة) بیروڕایەکی ئەوەندە گەوجانەو پڕو پووچ و فریودەرە، کە هەر پێویست ناکات بەلگەی زانستیشی لە دژ بهێنرێتەوە، چونکە ووشەکە هەر خۆی تەنها جێگەی پێکەنینە...

١٢- زانایانی پەرەسەندن چەندین جار ساختەکاری و تەزویر و فریو دانیان لە دۆزراوە بە بەرد بووەکاندا کردووە...

١٣- بیردۆزی پەرەسەندن هەردوو چاوی خۆی کوێر کردووە لە بەرامبەر هەبوونی (ڕوح)و هەرگیز باسی ڕوحی نەکردووە لە نەفسی مرۆڤدا لە کاتێکدا کە (ڕوح) لە جیهانی ئەمڕۆی زانستدا زۆر بە ڕاشکاوی دانی پیا نراوە...

١٤- ئەم بیردۆزە سەرەکی ترین ڕۆڵی بینی لە بڵاوکردنەوەی بیرو باوەڕی نەبوونی خواو ڕاگەیاندنی (جیهانی بێ خودا) کە بێگومان ئەمە گەورەترین ستەمە کە لە سەر ڕووی زەوی ئەنجام درابێت..

١٥- تیۆری پەرەسەندن هەرگیز لەگەڵ دەقەکانی قورئان ناگونجێت، ئەو زاناو کەسایەتییە ئیسلامییانەی کە هەوڵی لە یەك نزیك کردنەوەی دەقەکانی قورئان و بیروڕاکانی تیۆری پەرەسەندن دەدەن و دەیانەوێت میانڕەو بن لە نێوانیاندا، زۆر بە هەڵە داچوون، بەڵکو بیردۆزی پەرەسەندن بە سەختی شکست دەهێنێت بەرامبەر دەقە قورئانیەکان و بنەماکانی عەقیدەی ڕاست و ڕەوای ئیسلامی...

## سەرچاوەکان

أصل الأنواع... نووسینی/ تشارلس داروین.. وەرگێڕان/ إسماعیل مظهر...
الإنسان والداروينية... نووسینی/ محمد صالح كريم خان...
داروين ونظرية التطور... نووسینی/ شمس الدين آق بلوت.. وەرگێڕان/ اورخان محمد.
نظرية التطور وأصل الإنسان... نووسینی/ سلامه موسى...
رجال عاشوا للعلم.................... لورين إيزلی...
العلم يدعوا للإيمان....... نووسینی/ کریس مۆریسۆن...
خدعة التطور... نووسینی/ هارون يحيى...
نشوء الكون.......... نووسینی/ جۆرج جامۆڤ...
الإنسان الأول.......... نووسینی/ جۆل کارلس...
موسوعة العقائد والأديان.... نووسینی/ مازن المغايری...
قصة الفلسفة............ نووسینی/ ول ديورانت...
داروین لە تەرازووی زیریدا.... نووسینی/ محمد مەلا صالح شارەزووری...
گۆڤاری ئایدیا... ژمارە (٣_٤) ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٥...

# ناوەرۆك

پرسیارێکی هەستیارو ناسك لەمێژ بوو لە هەست و بیری مرۆڤدا دەخولایەوە کە هەردەم پرسیاری دەکردو دەیووت (ئایا ژیان چۆن دروست بووە؟)، داروین لە پێناو دۆزینـەوەی وەڵـامی ئـەو پرسـیارە، بـیردۆزی پەرەسەندنی دارِشت کە دەیووت لە سەرەتادا بە رێکەوت (الصدفة) زینـدەوەرێکی سـادەو سـەرەتایی لـە تەنۆچکەیەك یان خانەیەکی نازیندووی ژێر خاکدا بە کاریگەری ژینگە دروست بووەو پاشان ئەم زیندەوەرە بەرە بەرە پەرەی سەندووەو گۆڕاوە بۆ گیانداری تر، تاوەکو هەزارەها جۆری گیاندار لە یەکترییەوە دروست بوون و دواتر لە دوا قۆناغدا ئاژەڵێك دروست بوو کە لەڕووی عـەقل و زیرەکییـەوە تۆزێـك پێشـکەوتوو بوو، هەروەها لە ڕووی شێوازی هەڵکەوتنی ئەندامە جەستەییەکانەوە زۆر لە مەیموون نزیك بـوو، پاشـان ئەم گیاندارە پەرەی سـەندوو دوو لقـی لـێ جیـا بوویـەوە، لقێکیـان بوونـە سەرچـاوەی دروسـت بـوونی مەیموونەکان و ئەویتریش بەرەو پێشەوە پەرەی سەندو گـۆڕا بـۆ مـرۆڤ کـە لێـرەدا یەکـەم خـاڵی ژیـانی مرۆڤایەتی دەستی پێکرد!

کەواتە چۆلەکەو مشك و کیسەڵ و بزن و بەرازو مەیموون، باپیرە گەورانی مرۆڤن لە نەزەری داروین!، بـەم بیردۆزە تەم و مژاوییە، داروین ویستی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە کە دەیووت ژیان چۆن دروست بووە؟، بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە ئەم بیرو ڕایە پرسیارەکە نابڕێنێتەوە، بەڵکو مرۆڤایەتی ڕوو بـە ڕووی پرسـیارێکی زۆر دژوارتر دەکاتەوە ئەویش ئەوەیە کە (ئایا مرۆڤ لە داهاتوودا دەگۆڕێت بۆ چ گیانـدارێك؟)، چـونکە ئەگەر ڕاست بێت کە مرۆڤ بەهۆی پەرەسەندن و گۆڕانی جەستەی گیاندارانی پێش خۆیەوە دروست بـووە، ئەوا بێگومـان دەبێت چاوەڕێی ئەوە بکـات کـە لەسـەردەمێکدا، جەسـتەکەی ئـەویش بـە پەرەسـەندندا تێدەپەڕێت و دەگۆڕێت بۆ کائینێکی تر، بەڵام ئایا دەگۆڕێتەوە بۆ مەیموون و کەنغەرو سمۆرەو دەچێتەوە نێو دارستان وەك سەرەتاکەی، یاخود بەرەو پێشەوە پەرە دەسەنێت و دەبێتـە بوونـەوەرێك کـە ئەسـتێرە قوت بدات؟!. ئەسڵەن ئەمە گاڵتەجاڕی و یاری کردنە بە نرخ و قیمەتی مرۆڤایەتی..

**ناظم ناصح**

نوسینگەی تەفسیر
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: 2518138
موبایل: 07504605122
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
بەرگ: ئەمین موخلیص

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com
للكتب (كوردی ,عربي ,فارسي)